٩٩١٢٠٩
س
٢٤٦

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

# هۆزەکانی کورد

وەرگێران و ئامادەکردنی

حسین ئەحمەد جاف

بەغدا ١٩٩٢

# پێشەکی وەرگێر

خوێنەری بەڕێز

ئەمە کەرەستەیەکی خاوە .. ئەیخەمە بەردەستی ئێوەی خوێندەوارەوە بێ کەمو زیاد .. چۆن بینیومە ... وەها وەرم گێڕاوەتەوە . ئەگەرچیش هەندێ لەم هۆزانە ..ڕەنگە ئێستە بوونیان نەبێ ...، ئێمە بۆ بهێلین ژەنگو تۆزی لەبیرچوونو لەناوکردن دایان بگرێو ببێتە هۆی ناو سڕانەوەیان ... ئیشی من وەك وەرگێڕێك ، لێرەدا .. زیندوکردنەوەی ناوی ئەو هۆزو هێزانەیە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕۆڵێکی بالآیان لە ڕووداوەکاندا هەبووەو بوونەتە کۆسپێك لە ڕێی پیلانە چەپەڵەکانی عوسمانی‌یەکان بۆ بە تورککردنی ناوچەی کوردستانو تەروەنەکردنی ڕۆڵەکانی

خوێنەری ئازیز

کوردیش هەروەك .. میللەتانی دی ، خێڵو هۆزو ڕێخڕاوە تایبەتی‌یەکانی هۆزایەتی خۆی هەبووەو هەیە .. وەنەبێ ئێمە .. حەز لە زیندووکردنەوەی مەسەلە کۆنەکان بکەین هەرچەندە ئەگەر واشی بێ .. مەترسی‌یەکی ئەو تۆی

تێدا نی‌یە چونکە هەمو میللەتانی ئـەم دنیایـە بـەم قۆناغـەدا تێپەڕیونو شانازی بە ڕیشەو ڕەچەڵەکو ڕەگو بنجو بناوانو لق‌وپۆی خۆیان دەکەن جا بـۆچ بـۆ ئێمـەی کورد ‎••‎ ئـەم مەسەلەیە بە مەسەلەیەکی نامۆ بدەینە قەڵەم ‎••‎ تەنها ئەو پرسیارە ئەکەم ‎••‎هەرچەندە من نامەوێ ئەوشتە کۆنانە ‎••‎زۆر بایەخیان بدرێتێ کە لەئەندازە بەدەر بێ •

خوێنەری بـەرێز

ئەوەی ڕاستی بێ ‎••‎مارك سایکس ‎••‎نوسەری ئەم کتێبە قەت ڕۆژهەڵاتناسێکی ئاسایی نەبووە ‎••‎ سەردانەکەی ئـــەم کابرایە بۆ ناوچەی کوردستان تەنها لە بەر هۆیێکی زانستیانەو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی هۆزەکانی کـورد نەبـووە بەڵکو زیاتر لەبەر ئـەوە بووە کـە بتوانێ دەستنیشانی هـۆزو باری ئابووریو کۆمەلایەتیو ڕامیاری تەواوی هەرێمەکە بکاتو گەلالەیان بکاتەوە بۆ ئـــەوەی بیانخاتە بەردەســـتی نـەخشە دروستکەرانی وەزارەتی کولونی‌یەکانی ( وزارة المستعمرات ) بریتانیای ئەو سەردەمە کە ئەوەیان لە ئـاراد بووە‎••‎ تێـکرای ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو تەواوی ئەفریقیا بەخەنە ژێـر دەستەلاتی ڕژێمی خاوەن شکۆ پاشای بەریتانیای ئەو سەردەمە‎••‎ واتە مەبەستی سەرەکی کۆکردنەوەی ئەمە زانیاریانە دە پـازە سالێك پێشی شەری جیهانی یەکەم ‎••‎ لەبەر چاوی کالی ئێمـە نەبووە • هەمومان لەو ڕاستی‌یە دڵنیاین ‎••‎ ئەگەرجیش ئەمـە ڕاستی یەکەیە ‎••‎ بەلام تالێو تفتی ڕاستی نابێ ‎••‎ چاو بپۆشێ

له نرخی ئەو زانیاریە سەرەتاییانە •• هەرچەندە •• لەبنەڕەتدا
له پێناوی بەرژەوەندی ئێمەی کورد •• خڕنەکراونەتەوە •

وەرگێڕانی ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە •• وەك دەزانین ••بێ
سوود نین هەرچەندە ماوەیەکی زوریشیان بەسەردا تێپەڕی
بێت ••چونکە باری ئابوری و ڕامیاری و کۆمەلآیەتی هۆزو
هۆزایەتی میللەتی کوردمان لەو سەردەمەدا ئەخاتە بەر تیشك
••سەرباری ئەمەش•••هەمان ڕاپۆرتی وەرگێڕاو ئەوەشمان بۆ
ڕوون‌دەکاتەوە کە••کە چەندو چۆن سازمانی ئینتلیجنسی بەریتانیا
( منظمة الاستخبارات البريطانية )•• له بەر بەرژەوەندی تایبەتی
خۆیان ••هاتونەتە ئەم ناوچەیەو دەستیان خستۆتە ئیش و کاریەوەو
••ئەم هەمو زانیاریەو وردە زانستیانە یان •• کۆکردۆتەوە•••
لەبارەی کوردو ناوچەی کوردستان ئەم جۆرە •• ئیشەی ئێمە
••ئەچێتە خانەی کەلەپورەوە کە چەند سالی بەسەردا ••
تێپەربێ ئەوەندەی تر بەنرخو بە سوودتر دەبێ بۆ میللەت ،
چونکه پارچەیەکی بەنرخو دێرین له ڕژێمی کۆمەلآیەتی ئەو
سەردەمەمان بۆ تۆمار دەکات •• ڕاستە •• باری ڕەووتی ژیانی
ئەم خێلانە پاشی جەنگی جیهانی یەکەم •• گۆڕا •• بەلآم
لەگەل ئەوەشدا •• نەریتی کۆچەری •• تا ئەمڕۆش لەگەل
گۆڕانی هەلو مەرجی ژیاندا •• لەگەلێ شوێن و جێگەدا له
هەرێمی کوردستاندا هەر ماوەتەوە •• ئەگەر جێش دێی تازەو
گۆندی نوێ یان له بۆ خۆیان بنیاتناوه •



هەواڵنامەی کتێب

برای خوێنەرم

هیچ •• جۆرە پەراوێزێك بۆ روونكردنەوە یان بۆشێكردنەوەی هەندی خاڵ لەم •••كتێبە بەدی ناكرێ••چونكە وەك لە پێشدا ووتمان ئەم زانستیانەی كە لە دوو تۆی ئەم كتێبە جیان بۆتەوە •• كەرستەیەكی خاوونو پێویستیان بە لێكولینەوەو لەسەر چوێنێكی دوورو درێژتر هەیە لە دەرفەتێكی تردا لە لایەن پسپۆرو شارەزایانی ئەم مەسەلانە جونكە •• من بەش بەحاڵی خۆم •• جگە لە وەرگێرانی كتێبە كە هیچی ترم پێ نەكرا لەبەر ئەوەی كە سەرچاوەیەكی ئەوتۆم بەدەستەوە نەبو •• بۆ دەوڵەمەنەكردنی •• ئەو زانستیانە •• كە زۆر زۆر سەرەتایین•• جا ئومێدەكەم لەوانەی لەم مەسەلانە شارەزان بێنە پێشەوەو قولێ یارمەتی لێ هەڵماڵن •• بۆ ئەوەی خزمەتێكی بە سوودتر بە میللەت بگەیەنین لەرێی دەوڵەمەندكردنی ئەم جۆرە باسانە •• بە تێبینی بەنرخو لێكوڵینەوەی چڕوخەستو زانستیانە••

حسین جاف

بەغدا

١٩٨٨/٤/٣٠

## پێشەکی نوسەر (مارك سایكس)

ئـەم کەرستـە خـاوە ••کە لەم چەنـد لاپەڕانـەی بـەر دەستتان •• کۆبۆتەوە ئەنجامو ئاکامی •• گەشتێکی سەختو ستـەمی (٧٥٠٠) میـلەنو خۆلاسـەی چـاوپێکەوتنو گفتو گۆو لێکۆلینەوەو ساغ کردنەوەی بێ ژمارەن •••لەگەل پولیسو گاوانو شوانو قەتارچیو شێخو مەلاو دەم چەرمگی خێـلان چێوار و حەمالو سەرخێلو پیاوی ناودار کەپێیانم ڕادەبینی•• زانیاریەکی سەرەتاییم لەبارەی ئەوهۆزانەم بدەنێ •

ئەنجامی ئەو هەولانەم •••هەرچەندە ـ لەوەش دەترسـم کەوا • زۆر گرنگ نەبێ ـ بەلام لەگـەل ئەوەشدا •• هـەر ئومیدەوارم کە سوود بەخش بێ بۆ گەڕیدەکانی داهاتوو بـۆ ئەوکەسانەی کە دەیانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان ••لەم مەسـەلـەیە بکـۆلنـەوە •••

چونکە ••• تائێستا •• هیچ جۆرە باسێك لە سەر ئـەم مەسەلەیە بە زمانی ئینگلیزی نەنوسراوەتەوە •• من نـەمتـوانی لێکۆلینەوەیەکی چڕو خەست لە سەر کورد بنووسـم •• وەك بیبلۆگرافیایەك •• بەهەر حاڵ ••• من لەو بـڕوایەدام کـە

تەناتەت ئەم مەسەلەیەش لە گرنگی هەوڵدانەکەم کـەم ناکاتەوە
سەرە ڕای ئەمەش •• حەز دەکەم ئەوەش بزانن •• کە هەندێ
لە بەردەستەکانی گەشتەکەی دواییم سەر بەسێ بەشە گرنگەکەی
میللەتی کــورد بــوون •• جا لـە بـەر ئـەوە •• هیچ
کۆسپێکی ئەوتۆ ڕێگەی بەئەنجام دانە بەم ئیشە نەبوو ••••
سەبارەت بە زمانی کوردیشەوە • چونــکە ئەوانەی کـە ڕۆڵی
[تەرجومانیان] لەگەڵەمدا ئەبینی •• زۆر شـارەزای هـەردوو
زمانەکە بوون •• هەروەهاش •• کێشی جیاوازی شێوەکان ••
نەبوونە تەگەرەیەك لە ڕێی ئیشەکەمدا ••

لە ئامادەکردنی ••ئەم لیستەیەی ناوی هۆزە جیاجیاکانی
میللەتی کورد ••• من هەولێ • (ئاسان کردنەوەی)مدا •• بۆ
ئەوەی بە کەلکی ئەو کەسانە بێت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەیانەوێ
لـە سـەر ئـەم مەسەلەیە •• بکوڵنەوە ـ بەتایبەتی • کـە ئەو
( کاتەلوگە )م دانا کە لە دوو تۆیدا ناوی ئەو هۆزانەم ڕیزکرد
••کـە لە ڕێی بیستن یاخود بینین شـتم لـە بـارەیانـەوە
گەلاڵەکردووە •

پاش چەن هەوڵدانێکی سەرنەکەوتووم •• بـۆ ئـەوەی
بەشێوەیەك ئەو ناوانە ڕیـز بکەم کە ڕوون بن بۆ هەمو کەسێك،
بڕیارم لەسەر ئەوەدا ••• کە ناوچەی کوردستان بـە ســەر
شەش هەرێمی ســەرەکیدا دابەش بکەم •• بۆ هەر یـەکێ لـەم
هەرێمانە بەشێکم لە کەتالۆگە کە •• تەرخان کردوە هەروەهاش
••هەچ بەشێك ژمارەیەکی جیای هەیە بەم جۆرە••لیستەیەکی

(ئەبجەدی•)م کردووه بە ناوەکانەوه لەگەڵ ژمارەیەکی تایبەتی کە تەرخان کراوه بۆ ئەو هۆزه ••

بەر لەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بێنم حەز ئەکەم ••ئەوه بزانن ••کە ئەو هەرێمانەی لە سەر نەخشەکە دیاری کراون •• بەشێوەیەکی ئەتنوگرافیانە نەکراون •• بەڵکو تەنها •• وەك شێوەیەك •• بۆ جیاکردنەوەیان دانراون •

( مارك سایکس )

هەواڵنامەی کتێب

# بەشی ( A )

## پێشەکی

چەن تێبینییەك لە سەر کوردەکانی ئەم هەرێمە ، کە ئەم هەرێمەم هەڵبژارد .. وەك یەکەم هەرێم .. تەنها بــۆ ئــەو مەبەستە بوو ..کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەگەڵیا مامەڵە بکەم ... چونکە ئەو کوردانەی کە لێرەدا ســـەقام گیرن .. وەك بەروونی دیارە ـ وەچەی ئەو (کوردیونییانەن) کــە وادی خۆی واتە لە ســـــاڵی (٤٠١) پێش زایین کیشـــانەوەی هێزەکانــی (زینیفون) یان وەستانو بەتوندی بەرهەڵستی ســوپاکەیانکرد ...یان بەلای کەمەوە ئەم شوێنە .. شانۆی یەکەمی دەرکەوتنی میللەتی کوردە لەسەر ڕووخساری مێژوودا ئەم ناوچەیە کە بە چڕو خــەســتی لەلایەن دانیشتووە کوردەکانیان تەنراوە . بــەم شێوەیەی لای خوارەوە ئابلۆقە دراوە .

لەناوچەی باکورەوە بە دەریاچەی وانو ئەرمینای تەختەوە دەوردراوەو لە ڕۆژئاواوە ...بە ڕوبای دیجلەو لــە نــاوچــەی باشوورەوە بە دەشتاییەکانی عیراقەوە .. زۆربەی هەرە زۆری

دانیشتووانی ئەم ناوچەیە کوردن ••• بەهەر حـال •• نابیّ
ئەوەش لـە بیر کەین ••کە ڕەنگە کۆمەڵیّ ڕەگەزی بیّگانـەش
•••لە دەشتاییەکانیدا ئەژین و لەوانەیە هەندیّ لەو هۆزانە••
کـە وەك کــورد نەژاد لـەم لیّـکۆلینـەوەیەم باسکرابن و لـە
بنەڕەتدا ••کورد نەبن و وەچەی چەن کۆمەڵی جیاوازی تر بن
کە لە پاشاندا لەگەڵ ئەو خیّڵە جیاییانە تیّکەڵ بوون و بـوونەتە
کورد •• ئەو بیانییانە • یاخود بەلای کەمەوە •• ئەوانەی کە
بەنەژاد کورد نین •• ڕنگە بە عەرەبی ئارامی ••• بدریّنە قەڵەم•
وەك ئەوانەی لە دەوروبەری موسلدا پەرش و بلاون• ئارامییە
ڕەسەنەکانی ••ئەم ناوچەیە ••گاورە یاقوبییەکانی (عین کاوە)و
(ئاکریّ)و (کۆیە)ن•• کۆمەڵە بیانییەکەش •• تورکمانەکانـی
ئالتون کۆپری و کەرکوك و هەولیّر و بەدوو جوتیارە عەرەبەکانی
ڕۆخەکانی (دیجلە)و دەشتاییەکانی ڕۆژاوای (موسل)ن •

ئەو دوو کۆمەڵە خیّڵەی کـەمن لـە بارەیانـەوە •• هـەر
هیّشتا بەگومانم • خیّڵی شەبەکـی ژمـارە(٥)[1]و (بیجوان)ی
ژمارە (١٠) نو ئەستوریەکانی (هەکاری)و (ئامیدی)و (زاخۆ)ن
••ئەوانەی کەلەم لیّکولینەوەیە بە ئیشـــارەتـی (+)کۆ •••
ناوەکانیان دەستنیشان کراون •

(١) سـەبارەت بە شەبەکەکانی •• موسل •• ئەمانە کوردن و
بەشیّوەی گۆران ناخەفتن ئەکەن •• سەرەڕای ئەوەش••
شەبەکەکان خۆیان ئەڵین ئیمە کوردین — وەرگیر •

ئـەو پرسـیارەی کـە بـەزەقی ڕووی دەمیمان تێدەکات ئەوەیە :ـ ئەم گاورە نەستۆریانەی هەکاریو ••کە ڕێخراوێکی هۆزانەیان هەیە •• ئایا ئەمانە کوردێکی ڕەسەنن یان پەناهەندە گاورەکانن کە بەنەژاد ئارامین ••؟

ئەم پرسیارە هەر بێ وەلام ماوەتەوە •

ژمارەیەك لە کوردە ناودار و خوێنەوارەکان لەو بڕوایەدان کە ئەو نەستوریانەی هەکاری لـە بنـەڕەتدا کورد بوونو لـە دواییدا بوون بەگاور بەر لە ئیسلام •

لە لایەکی تریشەوە •• قەشە گاورەکان ••بە توندی ئەم بیردۆزە (نظریە)ی کوردەکان لە بارەی نەژادی نەستوریەکانەوە ڕەت ئەکەنەوە •

من ـکەسی خۆمـ ئەو دوو بیردۆزەیەی کوردو گاوڕەکان •• زۆر بەڕاستیان نازانم •• هەرچەندە ڕەنگە لەڕاسـتیەوە کەمی نزیكبن •• من لەو بڕوایەدام •• کە کاتێ گاورەکان لـە موسلو عیراق هەلاتنو پەنایان بردە لای کـوردە گـاورەکانی هەکاریو بوونە پەناهەندە لە لایانەوە ••• جێی داخمە کـە نەمتوانی بە تێرو تەسلی هەندێ زانیاری بەچنگ بێنم لە بارەی خێلـە نەسـتوریـەکانو ناوەکانیانەوە •• هەرچـەندە لـەمـەش بە تەواوی ئۆمید بڕ نەبووم ••• چونکە ئەمـە ئەرکی سەرشانی ئەو ( بعثە ئینکلیزیەیە ) کە کلیسای کانتربیری ناردویەتی بـۆ ئەم ناوچەیە •• کـە لەوانەیە ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئـەم بۆشاییـە

پڕیکاتەوە سەبارەت بە کوردەکانی ناوچەکە ئەتوانم بەم سێ بەشەی لای خوارەوە دابەشیان بکەم ..

١ ــ بەشی یەکەم...ئەم خێڵانەی لای خوارەوە ئەگرێتەوە ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٦ ، ٨ ، ٩ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ، ١٤ ، ١٥ ، ١٦ ، ١٧ ، ١٨ ، ١٩ ، ٢٠ ، ٢٢ ، ٢٣ ، ٢٤ ، ٢٥ :ــ ئەمانە هۆزە نیمچە کۆچەرەکانی دەشتو گردەکانی باشورن .

٢ ــ بەشی دووەم ..ئەم خێلانەی لایّ خوارەوە ئەگرێتەوە : ٢١ ، ٢٦ ، ٢٨ ، ٢٩ ، ٣٠ ، ٣١ ، ٣٣ ، ٣٤ ، ٣٥ ، ٣٦ ، ٣٧ ، ٣٨ ، ٤٠ ، ٤١ ، ٤٤ ، ٤٨ ، ٥٢ ، ٥٣ أي ، ٦٥ ، ٧١أي ، ٧١ بي ، ٧١سي ، ژ٧ ، ئەمانەهۆزە چیاییە نیشتەجێکانن

٣ ــ بەشی سێهەم : ئەم بەشە هۆزە شاخاویە نیمچە کۆچەرەکان ئەگرێتەوە .... کە پاشماوەی هۆزەکانی ترن بێجگە لە هۆزی ژمارە (٥٠) .

ئەوەی پەیوەندی بە بەشی (١)ەوە هەیە .... ئەم هۆزانە زۆر لەیەك دی ئەچن ..چ لە بارەی بارو گوزەرانو نەرێتەوەو چ لە ڕووی ڕومەتو ڕوخسارەو ....ئەم هۆزانە . نیشانەی دەوڵەمەندیو دەرامەتی باشیان پێوە دیارە .. چونکە زۆربەی زۆریان چێوارو شوانی دەوڵەمەندن .. کە خەریکی جوتیاریش بن .. ئەوە لەبەر هۆیەکی دوهەمێنیە (ثانوی) ..هەرچەندە زۆر جاریش .. خەڵکی دی بەکرێ ئەگرن ..بۆ ئەوەی

یاریاندا .. هەروەهاش لە نێو ئەم خێلانە .. ئاسنگەری کارامەو جولای دەست ڕەنگینو خێوەت دروستکردنی چاك بەدی ئەکرێت .. توانایی مێشکیشیان ڕەنگە لە سەرووی توانایی هۆزەکانی تردا بی .. لە بواری خوێندنو فێربوونیشدا دەستێکی بالایان هەیە .. سەرەڕای ئەمەش .. کۆمەلێ پیاوی لێهاتوی پیشەسازو بازرگانی وریاو کارامەشیان تێدا هەلکەتووە کە شایەنی ئەوەن ببنە خاوەن لێپرسینەوەی ڕامیاریو کۆمەلایەتی لە کۆمەلگایەکی شارستانیو پێشکەوتوودا .

ئەم کەسانە .. وان لە ژێر ڕکێفی دەسەلاتی وراثی هەندێ شێخو میرو بەگزادەو ئاغادا کە زۆر ئاژاوەچیو حەز لە هەراوبگرو ئاشوبن سەرباری ئەمەش بەدەستی دوژمنایەتی نێو خێلەکانیش ئەتلێنەوەو نالە نالیانە ئەو - کوردە نیمچە کۆچەرانە کە بە کوردی بەبە یان بابان ناسراون ناوبانگێکی چاکیان پەیداکردووە لە بواری ئازایەتیو لاوچاکیو توانایی ڕامیاریو چەلەنگیو میوانداری ...ئەگەرچیش ..ناتوانین ئەو مەیلەیان بۆ چەپاو جەردەیی لەبیربکەین بەلام .. بەگشتی سوارەی چاكو نیشان شکێنیان زۆرە کە گوللەیان قەت سەر ناکات لەم چەن سالەی دواییەدا وازیان لە بەکارهێنانی ڕمو شمشیرو زەرگو خەنجەر هێناوە چونکە بوون بە خاون چەکی نوێ وەك تفەنگو دەمانچە . بەش بەحالی خۆم گەیشتومەتە ئەو بڕوایەی کە لە سەر ئەوە سوورم کە هەر لە باپیرە گەورەکانی ئەم هۆزانە وادی خۆی سوارەی سوپا مەزنەکەی پارثیەکان پێکهاتووە

•••چونکە هەڵس و کەوتو نەش و نەماکردن و پیلانە تاکتیکیەکانی ئەم هۆزانە زۆر زۆر لە وانەی هێزەکانی سورنیاس Surenas ئەچن وەك بلوتارخ لە پەرتوکە بەناوبانگەکەی کە لەژێر ناونیشانی ژیانی کراسوس ە ، باسیکردوون •

خالید کوڕی وەلید وەك نموونەیەکی ئازایەتیو ئاینی پیرۆز لەلایەن ئەم هۆزانەوە تەماشا دەکرێت هەروەهاش خۆیان بەقەرزاباری ئەو پێشەنگە مەزنە دادەنێن کە وادی خۆی مەشغەلی ئاینی موسلمانەتی بۆ ناوچەی کوردستان هێناوە هەر ئەویش بووە کە بەهۆی ڕووناکیی ئاینە تازەکەوە ئەمانی لە شەوەزەنگی تاریکی بتپەرستیو ئاگرپەرستی رزگاری کردوون •

تیکڕای خێڵانی ئەم بەشە سونین ••ئەمانە لە مانگی تەشرینی یەکەمو تەشرینی دووەمو کانونی یەکەمو کانونی دووەمو شوباتدا لەو شوێنانەدا ئەژین کە بە ژمارە لە سەر نەخشە کە دەستنیشانکراون •

هەر ••زوو و لەسەرەتای مانگی ئازارەوە ئەچنەخێوەتو دەوارەوە تا دەوروبەری حوزێران لەهەمان کاتیشدا بەشێکیان بۆ وەزنە کۆچوڕەو ئەکەن و لەوێش هەر لەمانگی گەلاوێژەوە تا مانگی ئەیلول ئەمێنەوەو خێوەتو دەواری خۆیان هەڵئەدەن و کەپری جوان دروستئەکەن • کە تیایاندا •• ئەو وەرزە ئەبەنە سەر بەهەر حاڵ گوزەرانیان لەو شوێنانەدا خۆشبە ••

که سەرماو سۆڵەی پاییز دەستئەکا بە نوقورچ گرتن • ئەو کاتە دیسانەوە بۆ دێکانیان ئەگەڕێنەوە •••

گەلێ دەمچەرمگ‌و ئاغاو سەرخێڵەکانی ئەم هۆزانە ژنیان لـە هۆزە عەرەبەکانی ناوچەی مێزۆپۆتێمیا هێناوە •• هەرچەندە ژنانی ئـەم هۆزانە هێندە •• شۆخ‌و شـەنگ‌و ناسـکن هـەر نەبێتـەوە سەرە ڕای ئەوەش سەربەست‌و گفت لفت جـوان‌و ئازاو ڕێك‌و پێکن تەنانەت هەندێکیان نیشـانشکێن سـوار چاکیشن •• لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئەرکێکی پێ ڕانـەسپێراوە جگە لە بەڕێوەبردنی ئیش‌و کاری ناوماڵ‌و مەڕو ماڵات دۆشین‌و مەشکەو کەرەو ماست دروستکردن •

لقی دووەمی بەشـی سـێهەم •

هۆزە شاخاویە نیشتەجێکان بە تەواوی لە کوردەکـانـی ناوچەی بەبەوە چ لە ڕووی جل‌و بەرگ‌و چ لە ڕووی هەڵسـو کەوتو داب‌و نەریتەوە جیاوازن • ئەمانە پیشەسازی کارامـەو جوتیاری باش یان زۆرە کە بسـتێ ئەرز لـە دەوروبـەری لادێکانیاندا نیە بێ کێلان مابێتەوە • هەروەهاش توانایی‌یـەکی بێ وێنەو بێ سنوریشیان هەیـە لە بواری جۆگـەڵـە دادرِیـن‌و کارێز هەلکەندن‌و ئامرازی جۆراو جـۆریش بۆ ئیش‌و کـاری ئاودێران بەکاردەهێنن • ئەرزێکی بەپیت‌و بـووم‌و بـەرامێـکی کشتوکاڵی‌یەکی فرە وەك گەنم‌و جۆ ، کونجی‌و چاکترین چەشنی تـوتـن •

ئەم هۆزانە ـ هەر وەك هۆزانی ناوچەی بەبە لە سێبەری ڕژێمی دەرەبەگایەتی‌و شێخایەتی‌دا ئـەژین • نـاکۆکیش لــە نێوانیاندا باوە پیاوانیان •• هەمیشە بەچەکەوە ئەســـوڕێنەوە وەك دەمانچەو تفەنگ‌و خەنجەر •• هەروەهاش جـەنگاوەری کۆلنەدەرو نێچیروانی باشیشان تێدایە • لە ناوەڕاستی هـەچ دێیێك قەلایەکی سەختیان دروست‌کردوە بۆ ئەوەی لـە کاتـی جەنگدا پەنای بۆ بەرن و بەرگری لە خۆیان بکەن ••••••• سـەبارەت بـە بـاری گوزەرانی ئەم هۆزانە کە نیشتەجێن •• ئەمانە لە کەپری جوان‌و خۆشی کە لە سەربانی خانووەکانیانـدا دروست دەکرێن‌و وەرزی هاوینیان تێدا ئەبەنە سەر ژنانی ئـەم هۆزانە هەر وەك ژنانی ناوچەی بەبە پەچە دانانێن‌و سەربەست‌و ڕێك‌و پێکن • سەرەڕای ئەمەش •• جێگەی‌ڕێزو نەوازشیشن‌و بەچاوی قەدرەوە تەماشا ئەکرێن هەندێ لەم هۆزانە لەو باوەڕەدن کەوا لە پێشدا گاوربوون‌و ئـەوجا بوونەتە موســـڵمان •• تەنانەتیش بەشێکیان ئێستەو ئێستاش هەندێ لە بـاوەڕەکـانی سەردەمی بت پەرســـتیشـیان هەر پاراستووە • شـایـەنـی باسیشە •• کە جولەکەیەکی زۆر لـە نێو ئـەم هۆزە کوردانـە ئەژین و بەچاوی ڕێزو یەکسانیش ســـەیری‌ئەکرێن لە لایـەن کوردەکانەوەو کەس توخنیان ناکەوێ‌و لە ژێر هیــچ جـۆرە چەوسانەوەیەکدا نین بەلام بۆیان نی‌یە چەك هەلگرن یان خۆیان بخەنە ناو ناکوکی‌یەکانی نێو هۆزەکانەوە ئەگەرجیش بۆیان هەیە لەگەل هەمو هۆزەکاندا هاتوچوە بکەن‌و مامەلەی بازرگانیـان

لەگەڵدا بکەن تەنانەت لەگەڵ ئەوانەی کە دوژمنی ئەو هۆزانەی کە ئەمان لە نێوانیاندا گیرساونەتەوە بۆیان هەیە مامەلە بکەن.

باری گوزەرانی گاورە نەستوریەکانیش هەر وەك باری گوزەرانی موسلمانەکان وایە هەندێکیشیان خاوەنی سەروەتو ساماتێکی زۆرن .

لقی سێهەمی بەشی سێهەم :

ئەمانە پاشماوەی هۆزەکانی بەشی ( A ) ن ، شاخاویەکی نیمچەکۆچەرن هەندێکیان جوتیارنو هەندێکیان ئاژەلدارن لە جلو بەرگدا لە کوردەکانی بەشی دووەم ئەچن هەرچەندە وەك سروشت زۆر دڵ ڕەقو تورەن ..سەرەڕای ئەوەش مەیلێکیان بۆ چەتەگەریو رێگریش هەیە .

ژنانی ئەم ناوچەیە زۆر جوانن‌و دایمو دەرهەم خەریکی ئیش‌و کاری سەختن .

ئەم .. هۆزە کوردانە بە شێوەیەکی . گشتی لەڕووی بالاو شانو شەوکەتو ڕواڵەتەوە لەو کوردانەی بەشی یەکەمو دووم جیاوازن چونکە ئەمانە کەڵەگەتو بالا بەرزو ئێسك ئەستوورو ئەسمەرن ئەوەی بۆ یەکەم جار چاوی پیان کەوێ رەنگە بە کوردیانی دانەنێ ئەمانەش خەریکی گەرمیانو کوێستانن‌و لە شوێنێکی پانو بەریندا کۆچو رەو ئەکەنو وەك دیاردەیەك ئەم نیمچە کۆچەرانە هەژارو کەم دەرامەتو دەستکورتن . هەرچەندە ئەمانە موسلمانن بەلام ئەوەندە

مەسەلەی ئایینی‌یان بەتوندی هەڵنەگرتووە سەبارەت بە هۆزی ژمارە (٥٠)ی بەشی A ەو ٠٠ واتە میرانی‌یەکان کە لە ڕاستی‌دا لەهۆزەکانی تر لەگەڵێ ڕووەوە جیاوازن •

خوێنەری بەڕێز دەبێ ئەم چەند دێڕانە بە ووردی بخوێنینەوە کە لەبارەیانەوە نوسراون ٠٠ سەرەڕای ئەمەش ئەبێ ئەوە بڵێم کەوا خەڵکی باکوری عیراق‌و ناوچەی وەزنەو ئەو هـۆزانـەی دەوروپشتی موسل مەسەلەی کۆچەری بە شتێکی مەزن‌و گرنگ دادەنێن هەرچەندە • هۆزە شاخاویەکان ووشەی کۆچەر یـان شوان • بە موراديفێك بو دەرندە یاخـــود نەخـــوێنـــدەوارو دواکەوتو دادەنێن •

١ ـ داودە [ Daudieh ]

چوار هەزار خێزانن• هۆزێکی کـوردی جەنگـاوەری نیمچە کۆچەرە ••• لە سەر ڕۆخەکانی زێ گجکەدا نیشتەجێن• مەلەوانی چاکیان تێـدایـە ٠٠ سوارەی هەژاریشیان زۆرە • لە کوردەکانی بەبەن •

٢ـ دزەیـی

پێنج هەزار خێزانن • هۆزێکی کوردی گـەورەیـە ٠٠ بەشێکی کۆچەرەو ئەوی تری نیشتەجێ‌یەو خـەریـکی ئیش‌و کاری کشت‌و کالیە لەگەڵ هۆزی (جبور)ی عەرەبیدا لەڕێی ژن‌و ژنخوازی‌یەوە زۆرتێکن‌لن چونکە ژمارەیەکی زۆر لـەم هۆزە ژنیان لەو هۆزە هێناوە • گرانی‌و قات‌و بێ بارانی ٠٠

باری ئابوریانی شڕکرد ٠ سەرەڕای ئەوەش کوللە حەشری بە کشتو کاڵەکەیانی کرد ٠٠ ژنیان زۆر شۆخو شەنگو جوانە ٠٠سەر ئەبێچنەوە و وەك پیاو عەبای ئەستوری ڕەش بە سەریانا ئەدەن ٠٠ هیچ جلو بەرگێکی (ڕەنگاو ڕەنگ)م لە بەریاندا نەدی بەپێچەوانەی کوردەکانیتر ٠ ئەمانە سوارەی چاکو جوتیاری باشیان زۆرە ٠ مەڵبەندی ئەم هۆزە سوڵتان باغە کە ئەکەوێتە دەوروبەری [قەرەجوك داغ]ەوە ٠ لە کوردەکانی ناوچەی بەبەن ٠

### ٣ ـ شیخ بزەینی [ Sheikh Bzeing ]

چوار هەزار خێزانن ٠ هۆزێکی کوردی ئازاو جەنگاوەرە٠ ئازاوەچیو ملهورن ٠ هەندێکیان خەریکی تاڵانو چەپاون بەڵام سوار چاکو پیاوی ئازایان زۆرە ٠٠ مرۆڤی زیرەکو دنیادیدەشیان زۆرترە ٠٠ وەستای کارامەشیان هەیە کە خەریکی دورستکردنی دەمانچەی مارتینی ـ هیندین ٠ زستان لە دێکانیان ئەبەنە سەر هەرچەندە لە وەرزی بەهار ڕوو ئەکەنە ئەو دەشتە سەوزانەی دەوروبەریانو خێوەتو دەواری خۆیان هەڵ ئەدەنو بۆماوەیەك سەقامگیر ئەبن تا پاش دغڵو دان دورین ٠٠ واتە تا مانگی حوزەیران ٠

لەگەڵ ڕانو گاکانیاندا بەرەو سنوری ئێران دەکەونە ڕێ لەوێش ئەمێننەوە تاوەکو ( پایز ) واتە ( مانگی ئەیلول ) یان نەختێ درەنگتر ئەگەر وەرزەکە گەرم بوو ، ئەمانە کوردی بەبەن ٠

## [ Shykhan ] ٤ – شــێخان

(٥٠٠) خێزانێك دەبن . ئەمە هۆزێكی كۆچەری تەواوە.. كە خەرێكی ئاژەڵداریە ..ڕانەكانیان لە نێوانی ڕوباری دیجلەو هەردوو زێكە .. ئــەلەوەڕن .. ئــەڵێن ئەمانە .. هیچ پەیوەندیەكیان لەگەڵ ئێزدیەكاندا نی یە . دراوسێشیان لەگەڵ هۆزی (طی) عەرەبی‌دا ... نەبۆتە هۆی تێكەڵ بونیان لە ڕێ ژنو ژنخوازیەوە .

## [ Shabak ] شــەبـەك

(٥٠٠) خێزانێك ئەبن . نیشــتەجێن .. زانیاریـەكی ئـەو تۆمان بە دەستەوە نی یە لە بارەیانەوە .. هەندێ لە نوسەران بە شیعەیان ئەداتە قەڵەمو هەندێكی دیش ئەڵێن .. گوایە ئەمانە ئاینێكی نهێنی‌یان هەیە.... سەرباری ئەوانەش .. هەندێكی كەش هەن .... كــە ئەڵێن ئەمانــە ( بابایین )ن‌و پەیڕەوی پێغەمەرێك بە ناوی [ بابا ]وە ئەكەن .

## [ Mamund ] ٥ – مام وەنــد

ژمــارەی خێزانــەكانیــان . نەزانراوە .. من هیــچ لــە بارەیانەوە نازانم .. هەرچەندە ...بەڕای من.. ئەمانە ڕەنگە تیرەیەك بن لە هۆزی هەمەوەند [ ژمارە ١١ .. بەستی A ]

## [ Girdi ] ٦ – گــەردی

(٦) هەزار خێزانن .. هۆزێــكی بـەهێزە .. زۆربـەی زۆریان خەریكی ئاژەڵدارین یا خــەریكی كشتو كاڵن . ئازاو

جەنگاوەرن .. ناو بەناویش هەندێکیان بە تالانکردن خۆیـان
خەریك ئەکەن .. پۆشتەو پەرداخن ... سوار چاکیان زۆرە
جلو بەرگی کوردی ئەپۆش .. خۆشناوەکان دێن بۆ یارمەتیان
لە وەرزی کشتو کاڵدا .

لە وەرزی هاویندا .. هۆزی گەردی ..بە مەڕو ماڵاتەوە.
بەرەو ..ناوچەی [وەزنە]بە دوای لەوەڕدا .. ئەکەونە ڕێ...
بەشێك لەم هۆزە لە ناوچەی. ئوسکاف سافکا( Uskaf Safka )

گیرساونەتەوە لەگەڵ ڕێبوارو گەریدەدا زۆرباشنو بەمیوان
پەروەر ناوبانگیان پەیدا کردووە .. تیـرەیەکی کـەش لـەم
گەردیانە .. لە ناوچەیەك جێگرن کە چوار کاتژمێرە ڕێی یەك لە
ڕۆژئاوای [ عین کاوە ]وە دوورە ..

دزو جەردە لەم تیرەیەدا زۆرە. ئەم هۆزە لە کوردەکانی
بـەبـەن .

گـەردی ( A ) [ Cirdi ]

هەزارو دوو سەد خێزانن ..لە دەوروپشتی [گرد مامك]ەوە
.. هاتونەتە خوارەوە ... شەست سـاڵێك لـەمەو پێش ..
ئەمانە ئێستا وازیان لە ژیانی کۆچەری هێناوەو مرۆڤ ئەتوانێ
لەو خەڵکە چیاییانەی دەورو بەریان جودایان بکاتەوە..جونکە
دەست ڕەنگینو پیشەسازی دەوڵەمەندن .. دیارە ئێستـەش
لەگەڵ هۆزە ئەسلیەکەیاندا ..پەیوەندیـان هەیەو بـەردەوام
دیاریو پارەو پـول بۆ سـەرخێلەکانیان کـە لـە نـوچەی

نیشته‌جێن .. ئه‌ڵێن ئه‌م هۆزه لـــه کورده‌کـــانی ناوچه‌ی به‌به‌ن .

٨ ـ قـه‌ڵخـانـی [ Khalkani ]

(٧٠٠) خێزانێك ئه‌بن . نیمچه‌کۆچه‌رن .. هوزێکی هێمن‌و (بێ‌ده‌نگ)ن .. کوردی به‌به‌ن .

٩ ـ ســـورچی [ Surchi ]

(٣) هه‌زار خێزانن ... هـه‌زار خێـزان له‌مانـه بـه‌لای که‌مه‌وه ..کۆچه‌ری ته‌واون .. هیچ خاسه‌تێکی نامۆیان تێدا به‌دی ناکرێ .ئه‌مانه له کورده‌کانی ناوچه‌ی به‌به‌ن ... تیره‌یه‌کی بچووك لـــه هـــۆزی مامه‌خانلی ..کاتی خـــۆی و بـه‌ره‌و خواربونه‌ته‌وه‌و ..له ناو هۆزی سورچی‌دا تواونه‌ته‌وه و بوون به پارچه‌یه‌ك له‌م هۆزه بڕوانه ژماره (٢٦)ی به‌شی ( A )

١٠ـ بێـــجوان [ Bejwan ]

(٨٠٠) خێزانێك ئه‌بن . به کوردیه‌کی شکاوه که له‌گه‌ڵ زمانی عه‌ره‌بی‌دا تێکه‌ڵه .. ئاخه‌فتن ئه‌که‌ن .. دراوسێ‌کانیـان ئه‌مانه به نه‌ژاد تورکن‌و له موریده‌کانی حاجی به‌کتاشن .

١١ ـ هه‌مه‌وه‌نـد [ Hamawand ]

هۆزێکی ئازاو به‌جه‌رگ‌و چاونه‌ترس‌و به هێزو زیره‌کن.. سوارچاکی شۆخیان زۆره .. له کوردی ناوچه‌ی بـه‌بـه‌ن ..

هەروەهاش زیتەڵ پیشە سازو وریان •• تفەنگچیو نیشان شکێنان زۆرە •• سەرەڕای ئەوەش ئاسنگەرو جوتیاری چالاکن •••• ئەم هۆزە دزو چەپاوکەریشی زۆرە •• ئەوانەی چونە بازنە میریەکانەوە •• بوون بە موچەخورێکی باشو لێهاتوە وله سالّی ١٨٧٦دا •• (٦٠٠) سوارەیان ••کە تەنها شمشێرو ڕمیان•• پێ بوو •• شالاّویان کردە ناوچەی (قۆقاز)ەوەو گەورەترین زیانیان بە دوژمنان گەیاندوبە تالاّنو چەپاوێکی زۆر هاتنەوە •• عوسمانی‌یەکان زۆر لەم خێلە زویر بوون •• بۆیە لە دوا سالاّنی حوکمرانیاندا •• هەولێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی بێ هێزو لاوازیان بکەن بەلاّم بۆیان نەلوا چونکە ئەم هۆزە تاوەکو ئێستەش هەر بە ئازایەتیو بلیمەتیو زیرەکی بەناو بانگە •• ئافرەتی هەمەوەندیش لە جوانیو شۆخیدا بێ وێنەیە •••

ئەم هەمەوەندانە ••بە کوردیەکی باشو بەعەربیەکی باش ئاخەفتن ئەکەن ••• وادی خۆی بە سونگیو شیروزەرگو ڕم ئەچەنگان •• بەلاّم چەکی نوێو خەنجەری تیژ ئیستە ـ لە ناویاندا باوو بلاّوە •

## ١٢ ـ جاف [ Jaff ]

(١٠) هەزار خێزانێك ئەبێ •• هۆزێکی مەزنی نیمچە کۆچەرە •• هەروەك ـ هەمەوەندیش ئەم هۆزە زۆر بەناوبانگە••ئەلێن (صلاح‌الدین کوڕی أیوب)یش بە ڕەچەلەك ئەچێتەوە سەر ئەم هۆزە کوردە •••کە لەم دیوو ئەودیوی سنووری نێوان عیراقو ئیراندا نیشتەچێن بەگزادەکانیان بەوە مەشهورن کە پاشقول

تر ••هەرچەندە
ژمارەیان زۆرەو سەربەستن ئەمانە ـ وەك وتراوە ـ ئەوندە حەز لە چارەی ئەوروپاییەکان ناکەن • ئەمانە کوردی بەبەن .

١٣ ـ گـوّران [ Guran ]

ژمارەیان نەزانراوە •• کوردی بەبەن

١٤ ـ نـوریـدی [ Nuredi ]

ژمارەیان نەزانـراوە

١٥ ـ پیـران [ Piran ]

(٩٠٠) خێزانن ••لە داب‌و نەریتدا لە هۆزی ژمارە (٣)ی بەشی (A) ئەچن •• ئەڵێن ئەمانـە تیرەیەکن لـە هـۆزی (هەرتوش) •• بەهەر حال ـ چونکە من ئەم مەسەلەیەم بۆ ساغ نەبۆتەوە جارێ ••بە هۆزێکی جیایان دادەنێم •

١٦ ـ ئـالآن [ Alan ]

ژمارەی خێزانەکانیان •• نەزانراوە •• ئـەم نـاوە وەك [تیرەیەك] لەگەڵ لیستەی تیرەکانی هۆزی (هـەرتوش) دێتـە پێش چاومانەوە بەلاّم من هیچ جۆرە پەیوەندیەك لە نێوانیاندا بەدی ناکەم •••چونکە ئێمە لە بەشی (٢) ژمارە (١٥) (M) هۆزێکی دی دەبینین بە نێو ( ئالیان )ەوە ئەمانـە ••کـوردی بـەبـەن •

١٧ ـ بـاقی‌خاسە [ باکی‌کاسە ] [ Bakikassa ]

ئەمانە کوردی بەبەن •• ژمارەی خێزانەکانیان نەزانراوە ••

١٨ ـ گوروك ( غوروك ) [ Chawruk ]

کوردی بەبەن ••ژمارەی خێزانەکانیان نازانم •

١٩ ـ کیالونـەر [ Kialoner ]

کوردی بەبەن •• ژمارەی خێزانەکانیان نەزانراوە

٢٠ ـ ماڵـکاری [ Malkari ]

کوردی بەبەن ••ژمارەیان نەزانراوە

٢١ ـ خوشـناو [ Khoshnaw ]

دوو هەزار خێزانێك ئەبن •• بە تەواوی نیشتە جێن لـە وەرزی کشتو کاڵدا ••• یارمەتی گەردیو شیخ بزەنییەکان ئەدەن ••• هەروەهاش ئاگاداری کشتو کاڵو دەغڵو دانەکانیان ئەبن ••کە خۆشناوەکان بەرەو کوێستان کۆچ ئەکەن ••وەك جەنگاوەریش •• کەمتر ناوبانگیان هەیە ••یەکێ لە ئاغاکانیان ئەم چەن دێڕەی لای خوارەوەی بۆ گێرامەوە ••• لـە بـارەی ئەسڵو مێژووی ئەم خێڵە کوردەوە ووتی :ـ ئەمبوس بەدەست •••کوڕی سەراندوز بووە •• سەراندوزیش •• کە وەزیری سۆڵتان سەلیم ئەبێ یەکێك لە کوڕەزاکانی ئیمام حوسـین [ خوای لێ ڕازی بێ ] وەعدی خۆی مستیلەیەکی مۆرکراو بـە باپیرە گەورەی ئەمبوسی بەدەست •• ئەبەخشێ •• سەرەڕای

ئەوەش .. ئەو ناوچەیەی نێـــوان کرماشان و (مـوســـل)ی پێ‌داوە ..

ئەمبوسی بە دەستی ناوبراویش ... پاپیرە گەورەی هۆزی خۆشناو بووە .. ئەڵێن گوایە .. ( مەزدەك )و ( حنیفـه ) .. جێگەکەیەکی تایبەتیان لە لای ئەمانە ـ هەر لە مێژدا هەبووە .

٢٢ - بـڵبـاس [ Balbas ]

هۆزێکی ...سەر سنورە ..چوار سەد خێزانێك ئەبن.. نیمچە کۆچەرین ..وەرزی هاوین لە ناوچەی وەزنە ئـەبـەنـە سـەر .

٢٣ - ئـاکـۆ [ Aku ]

(٥٠٠) خێزانێك ئەبن .. نیمچە کۆچەرین ..بەشێکیـان لە (ڕانیە)دا نیشتەچێن ...سوارچاكو جەنگاوەری ئـازایـان زۆرە .. کوردی بەبەن .

٢٤ ـ مامش [ Mamash ] نزیکی دوو هـەزار خێزانن ..کۆچەرێکی‌تەواون .. هاوین لە ناوچەی ( وەزنە ) ئەبەنە سەر .. کوردی بەبەن .

٢٥ ـ مـەنــگوڕ [ Mengor ]

(٢٠٠٠) خێزانن .. هۆزێکی جەنگاوەری نیمچە کۆچەریە وەرزی هاوین لە وەزنە ئەبەنە سەر .

٢٦ ـ مامـە خـان [ Mamakan ]

ژمارەی خێزانەکانیان نازانم .. ئەم هۆزە بە تیرەیەك لـە

هۆزی سورچی ئەدرێتە قەڵەم ناوی (مامە خان) .. بە چەن شێوەیەکی جیا جیا لەم پەرتوکەی بەردەستمان .. باسی ئەکرێت .. جارێك بە نێوی (دیل مامە خان) لە بەشی ( C ) ژمارە ( 10 ) E و جارێك بە نێوی [مامەکان] وەك لە بەشی ( D ) مارە (٨٦) کە تیرەیە کە لە هۆزی جبرانلی ... هەرۆەهاش بە نێوی [ مامە خانلی ]یش بەر چاومان ئەکەوێت وەك تیرەیەك لە هۆزی سپیکانلی ( B . 9 ) ... هەندێ لە قەشە ئەرمەنی‌یەکان .. ئەڵێن گوایە مامە خانلی‌و هۆزەکانی ( N.9A ) .. بە نەژاد ئەرمەنی بوون بەڵام لە پاشا بوون بە موسڵمان‌و لە نێو هۆزە کوردەکاندا ... توانەوە .. منیش ئەڵێم .. واتە ( مارك سایکس ئەڵێ – وەرگێر ) لەوانەیە .. ئەمانە لە بنەڕەتدا .. هۆزێکی گاوری کۆچەربوون ....کە لە دواییدا .. بە تەواوی تەفرو تونابوون .... ( مامەخان ) یاخود (مامەگان) ..یان (دیڵمامەخان) .. هیچ خاسیەتێکی نەریتانەیان نیە ..کە جێی سەرنج بێ .

٢٧ – بالیکی – بالەکی [ Baliki ]

ژمارەی خێزانەکانیان .. نازانم .. هوزێکی سەرسنورە .. کە من هیچم لە بارەیانەوە دەست نەکەوتووە ...هەرچەندە ئەمانە هەن‌و لەسەر سنوردا ئەژین .. بەڵام لەوانەیە پەیوەندیەکیان لەگەڵ بالیکانەکانی .. ژمارە (٨١)ی.. بەشی ( D ) و بالیاکانلی ژمارە (١٥) بەشی ( E ) دا هەبێ ،

لەگەڵ ئەوەشدا .. چونکە ... بالیسکایەکانی ژمارە (٨١) زازان ، .. بەرای من .. مەسەلەی ئەو پەیوەندیانە .. ڕێیان تێ ناچێ .

٣٨ - پیراستینی [ Pirastini ]

(١١٠٠) خێزانن ... کوردی بەبەن .. لەدێی بچوکی خنجیلانەدا . نیشتەجێن .. زۆر لە خۆشناوەکانی ژمارە (٢١)ی بەشی (A) ئەچن

٢٩ - زیمزان [ Zemzan ]

ژمارەی خێزانەکانیان نەزانراوە

٣٠ - بەدیلی [ Badeli ]

هوزێکی کوردی سونی گچکەیە .. کە لە ناوچەی ڕواندوز نیشتە جێیە . ئەمانە ئەڵێن - ئێمە - هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان لەگەل بەدیلیەکانی ژمارە ( I D ) بەشی ( E ) دا نیە .

٣٠ ( أ ) - شیروان [ Shirwan ]

هوزێکی کوردی نیشتە جێیە .. ئازاو چەلەنگن .. ناوی ئەم خێڵە لە ناوی ناوچەکەیانەوە .. وەرگیراوە .. ژمارەیان (١٨٠٠)خێزانە .. پیشەسازو دەست ڕەنگینو میوان پەروەرن .

## ٣١ - هەرکی [ Herki ]

(٣٠٠٠) خێزانێك ئەبن •• هۆزێکی کوچەری هەرە گەورەیە کە لەهەندێ شوێن‌و ناوچەدا پەرت‌و بڵاون •• بەشێکیان لە دەوروبەری ئەرزرۆمدا نیشتەجێن‌و ••بەشێکیان لە ناوچەی (وان) بەڵام بەشە هەرە گەورەکەیان لە دەوروبەری شاری (موسل)دا ئەژین •• ژنەکانی ئەم هۆزە •• زۆر ئازاو پیاو ئاسایین •• لە وەرزی •• پایزدا ••• لە دەرودەشتدا ئەمێننەوە ••• هەندێ لەم هەرکیانە •• خەریکی ئاژەڵدارین‌و هەندێ تریشیان خەریکی بازرگانی ئەسپن •• ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی •• لە کۆمەڵگای بچووك •• بچووکدا •• ئەژین تیرەکانی ئەم خێڵە بەم شێوەیەی لای خوارەوەن ••

١ - میندان ( Mendan ) [مەندان] :- ئەم ناوە •• جارێکی دیش وەك تیرەیەك •••لە خێڵی میللی •• پێش چاومان ئەکەوێ کە لە سەرووی مێزوبوتێمیادا ••• نیشتەجێن •• بڕوانە ژمارە ( 16 ) (C) ی بەشی •

٢ - زێرهاتی ( ژێرهاتی ) (Zerhati) •• لە دەوروبەری دەریاچەی (وان)دا ئەم تیرە •• هەرکی‌یە خەریکی هاتووچۆو کڕین‌و فروشتنن •

٣ - زیدان ( Zeydan ) :- چەن جارێك ناوی ئەم تیرەیە دووپات ئەبێتەوە •• جارێك وەك تیرەیەك لە هۆزی پینسیانشیلی مەزن ( ژمارە (٧٣)ی بەشی A ) وجارێك وەك

تیرەیەك لە هۆزی (مۆیکان) بەشی ( B ) ژمارە (٢٠ . ( A

٤ ـ حاجی ( Hajji ) : (٢٠٠) خێزانێك ئەبن تیرەیەکە لە هۆزی هەرکی .. ئەم تیرەیــە .. بەشــە نیشتەجیٚکەی هەرکی‌یەکانە ... کە لە چەقی ئەو شوێنەی کە لە ژمارە (٣٢)دا دەستنیشان کراوە نیشتە جیٚیە .

٣٣ ـ بەرادۆســـت ( Baradost ): (١٥٠٠) خێزانێك ئەبن. ئەم هۆزە ناوی لە ناوی ڕووباری بەرادوست وەەگیراوە .

٣٤ أ ـ بـەرادۆســـت ( 33.A ) (٦٥٠) خێزانێك ئەبن .. هەر لە هەمان ڕووبار ... واتە ڕووباری بەرادۆست . ناوەکەی وەرگرتووە .

٣٤ ـ بـەرزان [ Berzan ] (٧٥٠) خێزانێك ئەبن . ناوی ئەم هۆزە لە ناوی ناوچەکەوە وەرگیراوە کەپیٚی ئەڵێن [بەرزان] .. بـەوە ناوبانگیان هەیـە کە جەنگاوەرن .. هەروەهاش بەو خێزانـە ئاینیەش کـەپیٚی ئەڵێن .. خێزانی شێخان .

٣٥ ـ نێروا [ Nirva ] (٨٠٠) خێزانێك ئەبن .. نیشتەجێن .

٣٦ ـ رێـکـان [ Reikan ] (٨٠٠) خێزانێك ئەبن .. نیشتەجێن

٣٧ ـ زێبـــار

(١٠٠٠) خێزانێك ئەبن ••• هۆزێكی كوردی نیشتەجێیەلە ناوچەی زێبـــار بریتی‌یـــە لە (٣٠) گوند •• لـەم هـۆزەدا جوتیـاری بـاش ، بـەنای چاك ، پیشـە ســازی كـارامـــە ڕەزەوانی بەتوانا بەدی ئەكرێت • ئەمانە زۆر میوان پەروەرن‌و لەگەڵ غەریباندا گەلێ باشن •• هەرچەندە لە ناو خۆیاندا •• هێندە كۆك نین •• سەر خێڵەكانیان لە ناو قەلاّی گجـــكە •• گجكەدا ئەژین ••• ڕۆلە كانی ئەم هۆزە ئازاو جەنگاوەرن •• هەر لە مێژەوە •• نـاكۆكـن لــەگەڵ هۆزی ژمـــارە (٣٤)ی بـەشـــی (A)

٣٨ ـ ئاشـاغی [ Ashaghi ]

هیچ زانیارێكم لە بارەی ئەم هۆزە كوردە نی‌یە •

٣٩ ـ حســـینە [ Hasseina ]

خێلێكی گجكەی پەرت‌و بلاّوە •• هەندێكیان كۆچەرن‌و ئەوانی تریان لە چەن دێیكدا لە دەوروپشتی شاری (موسل)دا نیشـتەجێن •

٤٠ ـ مزوری [ Misuri ]

هۆزێـــكی كـــوردی نیشتەجێیە •• ژمـارەیان (١٢٠) خێزانێك ئـەبێ •

٤١ ـ دۆســـكی [ Doshki ]

(٥٠٠) خێزانێك ئەبن •• لە شاری (دهوك)دا نیشتەجێن

دیارە .. ئەمانە بەشێکن لە هۆزی ژمارە (٤١) (أ) .

٤١ أ ـ دوسکی [ Doshki ]

دوو هەزار خێزانێك ئەبن .. پیشەسازو جوتیارن لە دەوربەری گیاڤر ( Giaver )

٤٢ ـ جەلالی [ Jellali ]

بە کۆچەرو نیشتەجێ .. ژمارەیان ئەگاتەنزیکەی چوار هەزار خێزان .. کە لە دەوروبەری ئامادەوە .. نیشتەجێن . ناوی ئەم هۆزە جارێکی تریش لە بەشی ( B ) ژمارە (١٤)دا دووپات ئەبێتەوە ... بەشی دووەمیش وەك دیارە .. لە ناوچەی ئامادەوە .. بۆ ئەم شوێنە کۆچ یان کردووە ئەوەی ڕاستیش بێ لام مەعلووم نیە بەتەواوی کە هۆزی جیلی کانلی ژمارە (١٢)ی بەشی ( B ) تیرەیەکن لە هۆزی جەلالی یان نەء ؟ .

٤٣ ـ کۆهان [ kohan ]

ژمارەیان تەنها حەفتاخێزانە .. کۆچەرن لە وانەشە تیرەیەك بن لە خێلێك کە من هیچ لە بارەیانەوە نازانم .

٤٤ ـ دێرێ [ Dere ]

ژمارەیان (٨٠٠) خێزانە .

٤٥ - بەرواری [ Berwari ]

ژمارەیان (٦٠٠) خێزانە •• هوزێکی نیشتەجێیە •

٤٦ - شیخان [ Shykhan ]

ئێزدین یاخود شەیتان پەرستن ••• ژمارەیان نەزانراوە•• نیمچە کۆچەرن •• ئەم هۆزانە • لە نزیك مەرقەدی ( شیخ عادی )ەوە •• نیشتەجێن •• کە مەڵبەندی ئایینی ئێزدیەکانەو پایتەختی سەرەکی تایفە ئاینیە کەیانە ••• هەروەهاش سەرخێڵی هۆزەکەش لە هەمان شوێندا جێگیرە •• هەرچەندەو بە پێی زانیاریم سەرخێڵەکەیان بە شێوەیەکی نهێنی ئەجوڵێنەوە •• لە ناو عوسمانی‌یەکاندا •• ئەم هۆزە •• ناوکەی لە ناوی شیخ عادی وەرگرتووە •• لەوە ناچێ کە هەچ جۆرە • پەیوەندیەك هەبێ لە نێوان ئەمانو ئێزدیەکانی (ژەنگار)دا هەبێ •• بێجگە لە پەیوەندیە ئاینیەکەیان •• بڕوانە بەشی (٢)ی ژمارە (١٩) •

٤٧ - ڕەشکان [ Reshkan ]

ژمارەیان نەزانراوە •• ئەڵێن هێندێکیان ئێزدین •

٤٨ - هەوێری [ Haweri ]

ئێزدین یاخود شەیتان پەرستن • ژمارەیان (٣٠٠) خێزانە•• ئەتوانم بڵێم ئەمانە جۆرە پەیوەندیەکیان لەگەڵ هۆزی (هوڤیرکە)ی ژمارە (١٥)ی بەشی (٢) هەیە •

٤٩ - سپێرتی [ Spirti ]

(٧٠) خێزانێك ئەبن •• کۆچەرن •• کە لە نزیك

خێوەتەکانیان تێپەڕیم ••• ئاوەکەیان دامێ •• ئەوەی ڕاستی بێ ماوەی ئەوەم نەبو لەوە زیاترم دەست بکەوێ لە بارەی ئـەم هـۆزە کوردە •

٥٠ ـ میـران [ Miran ]

هەزار خێزانێك ئەبن •• هۆزێکی ئاژەڵدارە • لە وەرزی بەهار لە جزیرەوە بۆ ناوچەی دەریاچەی وان سەر ئەکەونو لە سەرەتای پایزدا بۆ شوێنەواری ئەسلێ خۆیان ئەگەڕێنەوە ئەو هۆزە بەوە بەدناوە •• کە دزو جەردەو پیاوکوژی زۆرە••بەڵام ئەوەی جێی سەرنجو سەرسورمانە ئـەوەیە •• کـە ئەمـانـە زۆر لەگەڵ گەڕیدە ئەوروپیاییەکاندا نەرمو باشن ئـەگەرجیش بەپێچەوانەوە •• لەگەڵ موسڵمانەکاندا •• ڕەفتار ئەکەن •• وادی خۆی ئەمانە لەگەڵ •• گویانەکاندا ••• نارێکبوون•

٥١ ـ حەسـینا [ Hasseina ]

(٥٠٠) خێزانێکن •• پێم وایە ••ئەمانە پەیوەندیان بـە هۆزی (حەسینا)ی ژمارە (٣٩) بەشی ( A ) وە نیەیە •

٥٢ ـ سـیندی [ Sindi ]

ژمارەی گشـتی ئـەم هـۆزە ئەگـاتـە زیـاتر لە (١٥٠٠) خێزان • ئەم هۆزە •• هۆزێکی تێکەڵە لە فەڵەو موسڵمان •• هەرچەندە •• فەڵەکانیان ژمارەیان زۆر کەمە هۆزەکە برێتیـە لە دوو تیرە :ـ

١ ـ سلوپی کە (٦٠٠) خێزانە

٢ ـ گوللی که (٣٠) خێزانه •

٥٣ ـ گـۆیـان [ Goyar ]

(١٤٠٠) خێزانن ، ئەمە هۆزێکی گەورەو بەهێزە زیاتـر لـە نێوەیان نیشتەجێن‌و بەشەکەی دیان نیمچەکۆچەرە •• ئەم هۆزە بریتی‌یە لە چەن تیرەیەك کە من ناویان نازانم ژمارەیـەك (زازا)شیان لەگەڵدا ئەژین •••کە ئەتوانین شتێك لە بارەیانەوە بزانین لە بەشی ( B ) دا • ئەم هـۆزە ••• سـەربەستو ئازایە •• وادی خۆی ••ئەمانە (مصطفی پاشای میـران) یـان کوشت لەو شەڕەی کە بەرپابوو لـە نێو هۆزی میران‌و گۆیان لـە ساڵی ١٨٩٩ دا • شایەنی باسیشە •• کە ( مصطفی پاشـا ) سەرخێڵیکی مەزنی هۆزی میران بوو ••

٥٣ ( أ ) ـ شیرناخلی [ Shernakli ]

تیرەیەکە ••لە هۆزی گۆیان کـە لـە ناوچەی (شێرناخ) جێـــگیرە •

٥٤ ـ داخـــوری [ Dakhori ]

ژمارەیەکن لەو کوردە نیشتەجێیانەی دەوروپشتی •• کە لەوانەیە ••• لە بنەڕەتدا •• هەر بەشێك بن لە هۆزی گۆیان•

٥٥ ـ شـێریکـی [ Shiriki ]

(٢٠٠) خێـزانێـك ئەبن •• هـۆزێـکی دەوڵەمەنـدی نیشتەجێ‌یە •• ناوەکەش •• جـۆرە پەیوەندیەك ئـەگەێنێ •• لەگەڵ هۆزی (زیریکانلی) ژمارە (١٠)ی بەشی ( D )

٥٦ – بالآیان [ Balian ]

(٧٠) خێزانن •• نیمچەکوچەرێکی دەستکورتو پەرت بلاون •• زۆر لە هۆزی (هەرکی) لە ڕووی باری گوزەرانیانەوە •• واتە هۆزی ژمارە (٣٢)ی بەشی ( A )

٥٧ – ئایرو [ Eiru ]

(١٠٠) خێزانن

٥٨ – ئاتمانیکان [ Atmanikan ]

(٥) هەزار • خێزانن •••• هۆزێکی کۆچەری پۆشتەو بەرداغە لەنێوان ••• (بەتلیس) و (بوّتان) کە مەڵبەندیانە هاتوچۆ ئەکەن •• لەجلو بەرگدا •• لە (هەرکی) یەکانی ژمارە (٣٢) بەشی (A) ئەچن ••• ئەمانە کەمتر ئەسپ بەکار ئەهێنن وەك لە هۆزەکانی تر •• وەرزی هاوین لە دەشتاییەکانی (موش) بەسەر ئەبەن •

٥٩ – سیلوکان [ Silukan ]

(٩٠٠) خێزانن •• جوتیارو کوچەرن •• هەروەك ئاتمانیکان ••• وەرزی هاوین لە دەشتاییەکانی (موش) بەسەر ئەبەن •

٦٠ – کیچیان [ Kichian ]

(١٥٠) خێزانێك ئەبن ••کۆچەرن

٦١ – ئالیکانلی [ Alikanli ]

(١٥٠) خێزانێك ئەبن ••• کۆچەرن •• ڕۆڵێکی ئەوەندە

٦٧ ـ بیلی کار [ Bellicar ]

(١٨٠) خێزان... هۆزێکی نیمچه کۆچەرە ئەم هۆزە ... هیچ پەیوەندیەکی بە هۆزی (بیلیکی)و هۆزی (بلیکانلی) یەوە نی‌یە ...ئەمانە ئەڵێن گوایە لە سەر دەستی (خالد ابن الولید)ی ئەصحابە ..بوونەتە موسڵمانو هەر ئەویش بووە کە لـــە بت پەرستی ڕزگاری کردن .

٦٨ ـ خـانـی [ Khani ]

(١٨٠) خێزانن .. لە دەوروپشتی (قوشاب)ەوەجێگیرن

٦٩ ـ تـاکۆڵی [ Takuli ]

(٤٥٠) خێزانن .. لـەوە ئەچێ ئەم هۆزە تیرەیەك بێ لە هۆزی (زیلانلی) .. ئەمانە سەد ساڵ لەمەوبەر لە ئەرز ڕۆمەوە ..هاتونەتە ئەم ناوچەیە .. بەسەرو سیماو ڕواڵەت ... لـــە سپیکانلی‌یەکان ئەچن ...کە لە سەرووی دەریاچەی(وان)وە.. جێگیربوون هەروەك ئەوانیش لاوازو کـەم دەرامەتو کـــەم تەندوروستین .

٧٠ ـ .....

خێزانەکانیان ؟ ... لەبەر ڕووداوێکی نائاسایی ناوی ئەم هۆزەم لێ ون بوو بۆیە منیش ئەم ژمارەیە بە بۆشی ئەهێڵمەوە بە هیوای ئەوەی کە ڕۆژی لە ڕۆژان بگەڕێمەوە بۆئەو هەرێمەو سەر لەنوێ ناوەکەیم دەست کەوێتەوە .

## ٧١ - شـــكـــاك [ Shekak ]

ژمارەی خێزان : (٦) هەزار خێزانن •• هۆزێکی ناودارو گرنگە ئەرمەنی‌یەکانی هەرێمەکە •••بەم هۆزە ئەڵێن (ڕەڤەند) تەنها سێ مانگ ئەمانە لە خێوەتو دەواردا •• ئەمێننەوە•• جالە بەر ئەوە ئەتوانین بە نیشتەجێ‌یان بدەینە قەڵەم •

ئەمانەی لای خوارەوە ••تیرەکانـی ئـــەم هـۆزەن •• هەرچەندە من لەو بڕوایەدام کە ••ئەمانە زیاتر ••• کۆمەڵێکی رامیاری کۆنن کە هاوپەیمانی یـەك بـوون • نـەك لـە ڕێی خزمایەتی‌و خوێنەوە •• تیکلەڵاون •

أ - شـیـکەفتی [ Shekifti ]

(١٣٠٠) خێزانن بەتەواوی نیشتەجێن •

ب - موکـری [ Mukeri ]

(١٢٠٠) خێزانن •• بەتەواوی نیشتـەجێن ••• ئـەوەش بڵاوە •• کە ئەمانە لە بنەڕەتدا لە ئێرانەوە •• هاتونەتە ناوچەکەو (٥٠) ساڵ لەمەوبەر بونەتـە دوو بەشـەوە •• یەکێکیـان لـــە (نوردوس) (Nowrdos) جێ گیر بووەو ئـەوی تـریـان لـە ناوچەی قوشـاب •

ج - شـیڤیلی [ Sheveli ]

ژمارەی‌خێزان : نەزانراوە ••• ئەم تیرەیە جـارێـکی‌دیش لە دەوروپشتی (ئیسکیلیپ) دا خڕ ئەبێتەوە •• لەو بڕوایەدام کە

ئەمانە لەزەمانی سولتان سلیم •• بەزۆر ••• بەرەو ••ئەم شوێنە ڕامالڕاون •

أ ـ بوتان : ژمارەیان نازانم •

هـ ـ شیڤیلی ؟ ژمارەی خێزان ؟

و ـ شکاك : (١٠٠٠) خێزانێك ئەبن •• ئەمانە لقی باشوری هۆزی •• شکاکن •••• کۆچەرێکی تەواون •

٧٢ ـ زیـرزان [ Zerzan ]

(١٠٠٠) خێزانن •

٧٣ ـ پینیانشیلی [ Pinianishli ]

(١٢٠٠) خێزانن • هۆزێکی گەورەیە •• کە سەرۆکایەتی‌یەکێتی ئەم هۆزانەی خوارەوە ئەکات •• لەوانەشە نەختێ ستەمبێ بەووردی دەستنیشانی شوێنەواری ئەم هۆزە بکرێت چونکە من هەر ئەوەندە ئەزانم کە ئەمانە لەدەوروپشتی هۆزە سەرەکی‌یەکەن •• کە ژمارەی (٧٣) یە ئەژین •• یەکێتیەکەش بریتی‌یە لەمانەی لای خوارەوە •

١ ـ زیدان ( Zeydan ) •• هەندێ لەم هۆزە لەگەل هۆزی [مودیکی]ی ژمارە (٢٠ E ) •• ئەژین •• هەروەها•• بەهەمان ناو •••• تیر یەك لەناو هەرکی‌یەکاندا بەدی ئەکەین•

ب ـ بارکوشان ( Barkoshan )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •

جـ ـ کینار بیروش ( Kinarberosh )

د ـ سـوراتاوان [ Suratawan ]

هـ ـ بیـلیجـان ( Billijan )

و ـ جیللی ( Jelli ) •• لەو باوەڕەم کە ئەم لقێکە لە هۆزی ژمارە (١٢)ی بەش ( F )

ز ـ جیویجی ( Gewili )

خێزان ••؟ •• لەوانەیە •• ئەم هۆزە لقێك بێ لە هۆزی (١٢)ی بەشی

ح ـ شیڤیلان ( Shevelan ) •• دیارە ئەم هۆزە بەشێکە لـــە ( 71.C ) ( 71.E ) بەشــی E

ط ـ موسـانـان ( Musanan )

بۆ ئەوەی زیاتر لەبارەی ئەم هۆزە بزانین ئەبی سـەیری هۆزی ژمارە (١٢)ی بەشی ( B ) بکەین •

٧٣ ـ پنیانشـیلی بچـووك

(٥٠٠) خێزانن •• دیارە ئەمانە لە هۆزی ژمارە (٧٣)دوور خراونەتەوە •• ئەمانە ـ وەك پیان ڕاگـــەیاندم وادی خـــۆی بەکردەوەیەکی نالەبار تاوانبارکراون •• بەڵام ئێســـتەش •• نازانم ئەو تاوانە چیبوو •

٧٤ ـ کیڤـران [ Givran ]

ژمارەی خێزان :ـ نەزانراوە •••• ئەمە هۆزێکی گچکەیە

له ناوچەی ـ گیاڤردا نیشتەجی‌یە ••• ( Giaver )

٧٥ ـ شەمسیکی [ Shemsiki ]

(٩٠٠) خێزانن •• هۆزێکی ڕێك‌وپێـــکن •• مـاوەیەك کۆچەربوون بەلاّم ئێستە نیشتەجێن •• ئاغاکـــانیان خـۆیـان بەعەرەب نەژاد دادەنێن‌و بەچاوێکی سوکەوە سەیری ئەندامانی خێلّەکەیان ئەکەن •• بەهەر حالّ •• ئەندامانی ئەم خێلّە نابوت‌و بودەلّەن بەلاّم ئاغاکانیان •• شۆخ‌و شەنگ‌و جوانخاس‌و ڕێك‌و پێـــکن •

٧٦ ـ هـەرتوشـی

هۆزێکی کوردی ئێجگار گرنگە •• من ئەمە لێرەدا ئەلّێم وئەبێ ڕۆژێك لـە ڕۆژان ئـەم ڕاسـتی‌یە زانستیانە بسەلمێنرێ کەوا ئەم هۆزە •• ئەو ئەلّقە وۆنەیە •• کەوا کوردی عیراق بە کوردی ناوچەی ئەرمینیا •• ئەبەسێتەوە بەشە کۆچەرەکەی ئەم هۆزە •• بەوە بەدنابووە کە جەردەو پیاو کوژی زۆرە •

هەرچەندە • لە ڕووی باری گوزەران‌و سیماو ڕوالّەتی گشتی‌یەوە لە هۆزی (هەرکی) ئەچن •• بەلاّم هەرتوشی‌یەکـان لـە هەرکی‌یەکان دەولەمەندترن •

تیرەکانی ئەم‌هۆزە •• ئەمانەی لای خوارەوەن •

أ ـ ئیزدیان ( Esidian ) ژمارەی خێزان ••نەزانراوە• ئەلّێن ئەمانە ئێزدین •• هیچ هەلّەیەکیش لەناوەکە نی‌یە•

ب ـ میرزیگی ( Merzigi ) (٩٠٠) خێزانن •• لە دەوروپشتی • ( باش‌قەلاّ ) نیشتەجێن •

ج ـ مامەڕیش ( Mamerish ) : (٢٠٠) خێزانن •• نیشتەجێن •• لەو باوەڕدام •• کە ئەمانیش ئێزدین •• بەلاّم سەر بە ( هۆزی هەرتوش ) بن •

د ـ مامید ( Mamed ) : (٢٠٠) خێزانن •• لەو باوەڕەم ••کە ئەم تیرەیەی هۆزی (هەرتوشی) نیشتەجێیە •

هـ ـ ئالان ( Alan ) ژمارەی خێزان •• نەزانراوە ••

و ـ بیروز ( Beroz ) : (٦٠) خێزانن •• ئەمانە توتن چێنەرێکی هەر (بەناوبانگ) ن لەسەرانسەری ناوچەکە •

ز ـ جیریکی ( Jiriki ) ژمارەی خێزان •••نەزانراوە•

ح ـ شیدان ( Shid an ) ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •

ط ـ مامخور ( Mamkhor ) : (٤٠٠) خێزانن •• کۆچەرن ، جەنگارەرو ئازاشن •

ی ـ خاویستان ( Khawistan ) : ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •

ك ـ شەرافان ( Sharatan ) : (٣) هەزار خێزانن •• ئەم تیرەیە گەورەترین تیرەی هۆزی هەرتوشیە •• کە لە وەرزی بەهاردا ئەگەنە •• خواررووی •• ناوچەی (ئاکرێ) •

ل ـ مامەدان ( Mamadan ) : (٢٠٠) خێزانێك ئەبن ..
لەوبڕوایەم .. کە ئەمانە نیشتەجێن هەرچەندە هەندێکیشیان .
ناو بەناو .. ئەچنە خوارەوە .. تا دەوروپشتی شاخی (بێخێر)
کرد لە نزیك شاروچکەی (زاخۆ)یە .

م ـ گاڤدان ( Gavdan ) : (٣٠٠) خێزانن .. کۆچەرن
.. بەڵام زۆر بەوە بەوناون کە دزو جەردەو ناشارستانیان زۆرە
.. ئەگەرجیش .. خەریکی ئەسپ بەخێوکردنن ، لەوەرزی
بەهار لە دەوروبەری (زاخۆ) دا .. خێوەت هەڵدەدەن .

ص زێدك ( Zedek ) : کۆچەرن .

ع ـ زیکفی ( Zekfi ) : (١٥٠) خێزانن .. کۆچەرنو
ئاژەڵدارن .

ف ـ هافجان ( Hafjan ) : (٩٠٠) خێزانی کۆچەرن

# هۆزەکانی بەشـی دووەم

١ ـ موسـیك   [ Musik ]

ژمارەی خێزان : نەزانراوە .

ئەگەرچی .. ناوی ئەم هۆزە زۆرجار لە لیستەی هۆزەکانی ناوچەکە هاتووە .. ئەو لیستەیەی .. کە گەڕیدە پێشووەکانی ناوچە .. ئامادەیان کردووە . بەڵام من نەمتوانی شتی ئـەوتۆ وەدەست بهێنم لە بارەیانەوە .. لەگەڵ ئەوەشـدا .. ڕێـگەم بەخۆم نەدا .. لەبیریان بکەم .. چونکە مێژوونوسی کلـدانـی ناسراو .. (توما میردسیی) باسی کـردوون بـە هـەرحـاڵ .. (گوندێك)یش هەیە لە (موتیکان).. بەناوی (موسیك)ەوە... تەنانـەت کـوردەکانی موتێك ئـەم نـاوە بـەکـار ناهێنن وەك ڕێکخراوێکی هۆزایەتی .

٢ ـ پێنجی‌نـان   [ Penjinan ]

(٥٠٠) خێزانن .. ناوبانگیان وەك جەنگـاوەرو ئـازا پەیداکردووە . ئەڵێن هەندێکیان ئێزدین .

٣ ـ کیسـکولی   [ Keskoli ]

ژمارەیان •• نازانم •• من دلنیانیم تەنانەت لە بوونی ئەم هۆزە •• ڕەنگە ئەمە ناوێکی شارەوانی‌یە (محلي) بۆ بەشێك لە هۆزی پینجینان •

٤ – پوران [ Pouran ]

(٢٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرین •• ئاژەڵدارو خەریکی ئیش‌و کاری کشت‌وکاڵن •

٥ – شێخ دودانلی [ Shaykhdodanli ]

(٢٠٠) خێزانن • لە لام مەعلووم نی‌یە گەر ئەمانە کۆچەر بن •• یانیشتەجێ ••• چونکە خەڵکێکی بێ ژمارە لە دەورو پشتی ئەم هۆزەوە •• هەیە کە هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان بە هۆزایەتی‌یەوە نی‌یە ••• سەرباری ئەمەش هەندێ هۆی دیش هەیە •• کە ڕێگەی ئەوەمان لێ ئەگرێ •• زانیاری‌یەکی زۆر بەچنگ بهێنن لەبارەی ئەم هۆزانە •• ئەوەش •• حەزنەکردنی کوردانی ناوچەکەیە •• لە وە درخستن‌و دەربڕینی زانیاری لەبارەی ناوی هۆزەکانیان‌و خاسییەتە تایبەتی‌یەکانی خۆیانەوە • ڕەنگە ئەمەش پەیوەندی بەبارو زرووفی ناوچەکە بەگشتی‌یەوە هەیە •• ناوی ئەم هۆزە زۆرە نزیکە لە ناوی هۆزان دودێری ( Duderi ) و دودیکانلی •

٦ – بیرکان [ Berkan ]

(٥٠٠) خێزانن •• وەرزی زستان لە دیاربەکر ئەبەنەسەرو هاوین لەنزیکی (سعیرت) • ئەڵێن ئەمانە بە ڕەچەڵەك ئەچنەوە سەر باگراتونینەکان ( Baegratunians ) • قەشەی

ئەرمەنەکان •• زۆر سوورە لـە سەر ئەم ڕایەو بەدڵنیاییـەکی تەواوە باسی لێوە ئەکات• ناوی (پیکی ران)ی ژمارە ( 16 H ) بـەشـی ( C ) لە نێو ئیزدیەکـانی سـنجاردا •• یێتـە پێش‌چاومانەوە •• ئەو ئێزدیانەی سنجار ئەڵین بیکی رانەکان لە شوێنێك کە ئەکەوێتە باکوری ڕووبـاری (دیجلـە)وە •• هاتۆنەتە (سنجار)و تێیدا جێگیربوون •

٧ – ڕیش‌کوتانلی [ Reshotanli ]

(٥٠٠) خێزانن ، کۆچەرن ، ڕۆشـدینی‌یەکانیش •• زۆر جارباسیان لێ‌کراون لە مێژووی ( چـامیـك Chamich ) کەقەشەیەکی ئەرمەنی ناسراوە شایەنی باسیش ئەوەیە •• کـە لە یەك چووتێکی نامۆ هەیە لەنێو هەردوو ناودا •

٨ – بەشـیری [ Besheri ]

ژمارەی خێزان : نەزانراوە •• ئەمانە لەنێوان سعیرت ، میافارقین‌و دیاریەکردا نیشتەجێن •

٩ – تـریکـان [ Tirikan ]

(٦٥٠) خێزانن • نیشتەجێن لـە نێـوان فوراتو هاینی‌دا ( Haini ) عەودالی جل‌وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ‌و جوانـن • دوڵەمەندوپۆشتەو بەرداغ‌و زیرەکن • زۆر نەرم‌و نۆڵو کۆک‌و ڕەفتار باشن لەگەڵ ئەو کەمایەتی یە ئەرمەنی‌یە کە لەگەڵیانـدا ئەژی • ئەو ئەرمەنی‌یانەش ئەڵێن ئێمە لـەگەڵ کـوردا یەك

ڕەچەڵەکو یەك بنەچەیەك ڕەگەزین هەروەهاش ئەڵێن ئێمە کوردی ئەرمەنین‌و لە ئەرمەنی‌یەکانی تر جیاوازین • هەرچەندە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بەدل قەشە ئەرمەنی‌یە گەورەکەی دیاربەکرو تاقمە ئایینەکەی نی‌یە بەلام من ئەمەم لە قەشەیەك‌و سەرخێلێکی گاوری ئەو ناوچەیەم بیست •

١٠ - کوزلی‌چان [ Kuzlichavn ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە • هۆزێکی گچکەیە •• ناوەکەش لەناوی ناوچەیەکی شاخاوی ئەچێ •• کەئەکەوێتە باکوری دیاربەکرەوەبە (٨٠) میلێك•دیارە ئەم هۆزە لە باشوری هەرێمەکەوە بۆ ئەم ناوچەیە •• کۆچی‌کردووە •

١١ - زکێری [ Zekeri ]

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە

١٢ - موسی [ Musi ]

١٣ - سارمی [ Sarmi ]

٤٠٠ خێزانن

١٤ - جەلالی [ Jellal ]

(١٠٠) خێزانن

١٥ - خەزالی [Khazali ]

( ٥٠ ) خێزانە

١٦ - بدیری [ Bederi ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە

١٧ ـ مەلاشیخو [مەلاشی‌شێگو] [ Malashigo ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە

١٨ ـ بوسـیکان [ Bosikan ]

١٨٠ خێـزان .

١٩ ـ کـوریـان [ Kurian ]

خێڵانی بۆسیکانی ژمارە (١٨)و کوریانی ژمـارە (١٩) . هەروەهاش لقێ لەخێلی بوسیکان کە ژمارەی (١٥)یە .. لەو دەشتاییەی نێوان موشی‌و کابیل جوس‌دا نیشـتەچێن .. ئـەم هۆزانە هەر لەمێژدا وەك لە نێوانیاندا بـاوە .. وادی خـۆی شمشێری لە ئەرز چەقێنراوو مانگ‌و ئەستێرەیان ئەپەرست .. ئەمە لەسەردەمی حوکمرانیەتی .. پادشایەکی گاوردا .. کـە نـاوی [ تاڤیت ] ( Tavit ) بووەو لە قەلای ( بوســو )دا نیشتەجێ‌بووە .. دوابەدوای ئەوە شیخ نەسرەدین ناوێك کـە نێراوی خەلیفە عەباس‌یەکانی بەغدا بوو بۆ ناوچەکە .. لەگەڵ هێزێکی گەورەدا بەگژی (تاڤیت)و سوپاکەی ئەچن‌و لەپاشـدا ئەیگرن‌و ئەی‌کوژن .. ئەوجا خەلکەکە بە ئاینی موسلمانیەتی ئاشنا ئەکەن‌و ئالای ئاینە نوێ‌کە بەسەر تێـکڕای ناوچـەکـە هەل‌ئەکرێ ... سێ شازادە لەگەل نەسەردین‌دا هـاتـوبـوون ئەوانەش [زەکریا ، سارو و موسێ] بوون .. هەریەك لەمـانـە کۆمەلی موریدو لایەنگری لەگەڵ خۆی‌دا هێنابووە ناوچەکـە ... ئەو موریدو لایەنگیرانە بوونە هۆی پێکهێنانی هـۆزانـی

( زیکیری ) ژماره (۱۱)و موسێ ژماره (۱۲) و ( سارمی ) ژماره (۱۳) •• دوای ئەمە •• هۆزانیتر وەك مەلاشێخو (مەلاشیگو)ی ژماره (۱۷)و بدیری ژماره (۱٦)و جەلالی ژماره (۱٤) بەهەمان ڕێگەداچوونو بوونە هۆی هەلکەندنو ڕاونانی هۆزانی بوسیکانو کوریان ••• بەرەو •• ناوچە شاخاویەکانی باکور ئەوسا تێکەڵبوون لەڕێی ژنو ژنخوازیەوە لەگەڵ ئەرمەنییەکانی ناوچەکە کە ئیدیعای ئەوە ئەکەن گوایە لەنەوەی (تاڤیت)ی پاشان • دیارە ئەرمەنییەکانی ناوچەکە لەگەڵ ئەوانەی موشیو گوندەکانی دەوروپشتی دەریاچەی (وان)دا هیچ جۆرە پەیوەندیو لەیەکچوێك لەنێوانیاندا بەدی ناکرێ سەرەڕای ئەوەش •• مرۆڤ ناتوانێ لەکوردەکانی برسیکانو کوریان چ لەڕووی ڕوومەتو ڕوخسارەوە چ لە ڕووی جلوبەرکەوە جیایان بکاتەوە •••

بەشێ لە هۆزی (مەلاشێخو) و (هۆزانی) ژماره (۱۱) و (۱۲) و (۱۳) و (۱٤) و (۱٦) خۆیان بەعەرەب نەژاد دادەنێن•• ئەگەرجیش عەربیەکی شکاو ئەزانن ولەگەڵ یەکدیداپێی دەدوێن کە زۆر زۆر لە زمانی عەرەبی ڕاستقینەوە دوورەو ئەتوانم بڵێم چەن زمانی ئیتالی لە فەرەنسییەوە دوورە عەربییەکەی ئەمانیش •• لە زمانی عەرەبی ئەسلەوە دوورو جیاوازە •• بەلی ئەوانەی دەوروپشتی (سعێرت) عەرەبی ئەزانن •• بەلام عەرەبییەکان گەلێ لەوەی ئەمان پاراوترەو لە ناوچەی (تیلۆ)دا گوندێکی مەزن هەیە •• ئەکەوێتە دەوروبەری (سعیرت)ەوە •••، شێخ

(نەسرەدین) ناوێك هەیە كە ئیدیعای ئەوە ئەكات كە ئەمیش لە
نەوەی ( شێخ نەسرەدین ) ئەسلی‌یە •• برازایەكی ئەم شێخ
نەسرەدینە پێ ڕاگەیاندم كەوا تاپۆنامەیەكی كۆنیان لەلا هەیە
ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سولتان ( سلیم )و هەر مۆری ئەویشی
پێوەیە • پاشی ئەوەی سولتان سلیم بەسەر سوپای ئێراندا
زاڵبووو لە هەرێمەكە ڕایانی ماڵی ، ناوچەی ( تیلو )و گەلی دێی
بەراوی كەی بە هۆزی شیخ نەسرەدین بەخشی •

ئەم وچەیە •• واتە ( وچەی شیخ نەسرودین ) خۆیان
بەنەوەی عەباس‌یەكانی بەغدا ئەزانن•• ئەگەرچیش بە درێژایی
تەمەنیان لە كوردستان یەك بست دوور نەكەوتونەتەوە
هیچ شوێنێكی كەیان نەبینیوە •• جا بۆ ئەوەی زیاتر ئەو
ئیدیعایەیان بسەپێنن ••لە نێو خۆیاندا بە عەرەبی‌یەكی باش
ئاخەفتن ئەكەن •• هەر هەمان برازای ( شێخ نەسرەدین ) كە
دیارە خوێندەوارێكی چاكە ئەوەی پێ ووتم كەوا ئەو خۆی لەو
باوەڕەدایە كە هۆزانی • ژمارە (١١) و (١٢) و (١٣) و (١٤)و
(١٦) و (١٧) هیچ چەشنە پەیوەندیەكیان بە عەرەبەوە نی‌یە وەك
نەژاد •• بەڵام كە ئاینی ئیسلام لە ناوچە كە بڵاوبووەوە •
ئەمانیش چونە ئاینەكەوەو ناوی هۆزایەتیِ خۆیان گۆڕی فێری
زمانی عەرەبی بوونو پاشان وایان لێ كرد كە هیچ جۆرە
پەیوەندیەكی نەمێنێ لەگەڵ ئەسلەكەیدا •

٢٠ ـ موتیكان ( مودیكی ) Modeki ( Motikan )

ئەمە ناوی •• ناوچەیەكی شاخاوی نامۆو سەختە لە

باکووری (بەتلیس)ەوە کە بە شێوەیەکی نا مەقسوودە بووە بە عینوانی ئەو کوردانە کە لەوێدا جێ گیرن .. چەند هەولمدا پێیان بگەم و بچمە ناویانەوە ... نەمتوانی ئەوەیپەوێ ئەو شوێنانە ببینێ ئەبێ بە پێیان بروا .. دیارە زۆربەی ئەو کوردانەی کە لەوێدا جێگیربوون .. زازان .. بەلام زۆر بەئەدەب و فیطریو کەم دوونو قسەکردن لەگەلیاند ئاسان نی یە.

من ئەم زانیاریە کەمەم لە باریانەوە لە هەندێ لەو کوردانەی کە لە ناوچە (موتیکان)دا ژیابوون وەرگرت .. ئەمەی لای خوارەوەش خێلەکانی ئەو ناوچەیەن :

أ ـ کیبوران ( Keyborar ) کوردی زازان

ب ـ بوبانلی ( Bubanly ) کوردی زازان

ج ـ کوسان ( Kusan ) کوردی زازان

د ـ ڕوچابا ( Ruchaba ) کوردی زازان

هـ ـ زێدان ( Zeidan ) کوردی کرمانجن

و ـ ایریکلی ( Erikli ) هدندێ جار پێیان ئەلێن خیاترا ( Khiatra )

ز ـ پیرموس ( Pirmus ) کوردی کرمانجن

هەمو راپۆرتەکان ئەوە ئەسەلێنن کەوا هۆزی بوبانلی کۆترین تیرەی خێلی (مودیکی)ن زیدانەکانیش وەك لە ژمارە (٣٢)ی بەستی ( A ) و ژمارە (٧٣)ی بەشی ( A ) لەم لاو لەولا

پەرتو بڵاوبوونەتەوە •• ئەگەر ئەو چیروکەی کەوا ئەڵێ موتیکانەکان وادی خۆی کۆیلەی زازاکان بوون ، ڕاست بکات ئەوە خۆ ئەو مەسەلەیەمان بۆ ساغ ئەبێتەوە •• کەوا موتیکانەکان وەك پەناهەندە هاتوونەتە ئەوشوێنە بە تایبەت ئەگەر زانیمان چەند ئەو ناوچەیە دژوارو سەختەو ڕێگەی هیچ جۆرە سەرکەوتنێك بۆ دوژمنان نارەخسێنێت ئەگەر چیش سوپایەکی چەکداری زێكو پێکیش بێت • دیارە زازاکانی موتیکان نە موسڵمانن‌و نەفەلەن من لەو باوەڕەدام گەر بتواندرێت (إستکشافێکی) تەواوی ئەو ناوچەیە بکرێت ، ئەوە گەلی زانیاری بە نرخمان ئەکەوێتە بەر دەست لە بارەی ئەو خێڵانەوە •• جگە لەوەش ناوچەکە ئەخاتە • بەرتیشكو ڕەنگە زۆر شتمان بۆ ڕوون بکاتەوە •

تەنانەت لە بارەی مێژووی ئەرمینیاش ئەگەر چەردەیەکی باشی لە فولکورو کەلە پوورو ئەفسانەی ناوچەکە کۆبکرێتەوە •

٢١ - پینجاری [ Pinjary ]

(٤٥٠) خێزان •• لە ناوچەی ساسوندا • (Sasun)
نیشتەجێن‌و بە کرمانجی دەئاخەڤن •

٢٢ - سلیڤان [ Slivan ]

ژمارەی خێزانەکانیان •• نەزانراوە •• لەوانەشە زازا بن

٢٣ - ئەو کۆمەڵە زازایە کە سەر بە هیچ هۆزێك نین•••

نزیکەی (١٠٠٠) خێزانێك ئەبن •• لە پاڵ ئەمانیش ژمارەیەکی دیش لەم زازایانە •• پێش چاومان دەکەون •• کە ئـەوانیش سەر بە هیچ لایەك نینو لە پاشا گەردانیەکی تەواودا ئەژین •• ئەگەرجیش زۆر دڵ ڕەق نینو حەز لە تاوانکردن ناکەن بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوە ناچێ •• بایەخێکی ئەو تۆ بـە ژیانی • مرۆڤ بدون •• ئەمانە بە ئەوپەری ڕاستەو خۆییەوە ئەڵێن ئێمە وەك دڕندەکانی ناو دارستانەکان ئەژین •• ئەمەش خەتای ئێمە نی‌یە •• سەرە ڕای ئەمەش •• ئەمانە لەوە ناچی کە بڕوایان بـە هیچ ئاینێك هەبێ •• وەك نمونەیەك بۆڕاستەوخۆیی ئەم خەڵکە •• من ئەم ڕاستی‌یەئە خەمە پێش چاوی خوێنەری بەرێزەوە ؛ ئەڵێم •• ئەوانەی چونە ڕیزی سوپاوەو خزمەتیان لـە سوپادا کـرد •• بـە جارێ گۆڕانو بوونە موسلمانێکی تـەواوو لـە خواترسو بە چاوی شەرمو پەشیمانی‌یەوە سەیری ڕابوردووە بەرەڵلاکەیان ئەکەن ••• دیارە ئەمانە زانیاریەکی ئـەوتـۆیـان لە بـارەی ڕێخراوی هۆزایەتیەوە نی‌یە •• هەروەهاش ئەمانـە بەزاری زازا ئاخەفتن ئەکەنو وەك زانیم زۆربەیان پاڵەو جوتیاری هەژارو دەست کورتن • زازاکان • بـە شـێوەیەکی گشتی باڵا کورتنو بە دەنگێکی بەرزو ناساز لەگەڵ یەکدا ئەدۆین بەڵام زۆر بە ئەدەبنو لەگەڵ غەریبدا زۆر باشن • من لەو بڕوایەدام •• کە ئەم خێڵە وچەی میللەتێکی فیطری چیایین وەك ( بهیلیس ) تەنها جارێك بە خزمەتی ئەو زازایانـــە گەیشتووم ئـەوەش لـە دەشتاییەکانی دەوروبەری (سیڤیریك)دا •• کـە ژمارەیەك لـــە ئەمان لەگەڵ قەرەچەکاندا دراوسێن •

٢٤ – کێــدەك [ Kedak ]

( ٦٠٠ ) خێزانێك ئەبن • لە خواروی پیرادا ( Pira )
کە ئەکەوێتە سەر ( Veshinsagh ) ەوە نیشتە جین •

٢٥ – ئاشمی شــارت [ Ashmishart ]

(٥٠٠) خێزانێك ئەبن • زازاو شیعەن

٢٦ – کــولبن [ Kulbin ]

ژمارەیان •• نازانم ؟

٢٧ – گــەروس [ Carus ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• بێجگە لە ناوەکەی ئەم هۆزە •• هیچی دی لەبارەیانەوەم دەست نەکەوت • بەهەر حاڵ، ئیبرایم پاشا ناوەکەیانی داوە •• [ڕەنگە مەبەستی لە ئیبرایم پاشــای میللی بێ – ح أ • ج ] •

٢٨ – ســینان [ Sinan ]

ژمارەیان نەزانراوە •• زازان

٢٩ – ئیلیــا ( عیلیــا )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن • بەڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ئەمانە زازانیان کوردی کرمانجن •• ستەمە •

٣٠ – بەهــیرماز [ Behirmas ]

٥٠٠ خێزانن •• زازانو شیعەن

٣١ – دەرســیملی [ Dersimli ]

ئەو کوردانەی کە لە دەرسیمن •• جگە لە هۆزانی ژمارە بەشی ( 31 C ) شاوك •• لەوە ئەچێ کە سەراپای ( B ) هۆزەکانی دەرسیم خوا پەرست نەبن ••• هەرچەندە خۆیان بە ( شیعە ) دادەنێن •• ئەشتوانم بە دلنیاییەکی تەواوەوە ئەوە بلێم کە •• ئەو ئاینەی ئەمان پەیرەوی ئەکەن بریتی‌یە لە کۆمەڵی باوەڕی نامۆی تێکەڵو پێکەڵ ••کە ئاوێتەیەکی تەواوە لە نێوان جادوو سروشت پەرستی ••کە دیسانەوە •• بەرەو جادەی خوا نەپەرستی ئەیانبات •• یەکێ لەو دەرسیمانە پێی وتم :ـ

من •• خوا ناپەرستم ••پارچە •• چۆن ئەتوانێ هەمو پەرستێ ••• بەهەر حاڵ ئەمانە •• موسلمانی شیعەن بەڵام لە چوارچێوەیەکی ( خارجی‌یانە ) •• هەمیشە بە ئیمامی ( عەلی ) سوێند ئەخۆنو پێ ئەڵێن مەزنترین پێغەمبەر ڕەنگە ـ وەك پێم وایە ـ ئەو شتە زیاتر ئەکەن بۆ ئەوەی دڵی سونیەکانی پێ ڕەنجێنن •

لە نێو ئەو دەرسیمیانە دزو درۆزنو جەردەو ڕێگرو پیاو کوژ زۆرن •• هەر چەندە لە ئازایەتیان فرە دڵنیا نیم چونکە لەوە ئەچێ بە بچوکترین هێز ئەتوانرێ سەر کوت بکرێن •

لەو دەشتەی تەنیشتی دەرسیم •• چەن هۆزێك هەن کە لە سێبەری رژێمێکی دەرەبەگی‌دا ئەژین ئەو بەگزادانەش بە نورکی قەسە ئەکەنو ژنەکانیان پەچەو عەبا لەسەر ئەکەن •

أ ـ میلان ( Milan )

ئەم هۆزە دایکی ڕەسەنی ئەو یەکێتی یەمەزنەیەکە بە

یەکێتی هۆزانی میللی مەشهورەو لە باکوری (وادی الرافدین)ەوە جێ گیرە کە لەگەڵ یەکدیدا •• تاوەکو ئێستەش بە پەیوەندی‌یێکی هەرە قوول ئەیان بەستێتەوە •• جا بۆ ئەوەی هەندێ لە تایبەتیەکانی ئەم هۆزەو ئەم ئەفسانەیەی کە لە بارەی ناوەکەی باوو بلاوە •• ئەبێ سەیری ژمارە (١)ی بەشی ( G ) بکەین •

ب ـ کەچەل ( Kechel )

(١٠٠٠) خێزانن لە نزیکی پالۆەوە •• جێ گیرن •

ج ـ شاواك ( Shawak )

ژمارەیان •• نەزانراوە •• نیشتەجێن •• لەم دواییەدا بوون بە سوننی •

د ـ فەرهاد ئوشاغی ( Ferhadushaghi )

لە دەوروبەری سەر پیگناندا ( Surpignan ) دادەنیشن ئەوەی جێی سەرنجە لەم هۆزەدا ئەوەیە کەئەم هۆزە تاکە هۆزی کوردە کە بە پیتی (ف)ێ دەست پێ ئەکات •

هـ ـ بەختیارلی ( Bakhtiarli )

ژمارەیان بەتەواوی نازانرێت •• هەرچەندە ڕەنگە سی گوندێك لە نزیك ( جیمیش قیزیك )ەوە جێگیربوونەتەوە ، نیمچە کۆچەرن یاخود بەلای کەمەوە موهاجرن •• دوو گوندی دیشیان هەیە یەك لەسەر شاخەکەو ئەوەی تریان لەناو دولەکەیە•

و ـ کارابانلی ( Karbanli )

ژمارەیان ... نەزانراوە .. لە (ئاسونیك)دا ( Asunik )
ئـەژیـن .

ز ـ ئـەباسـانلی ( Abbasanli )

ژمارەیان نەزانراوە .. هۆزێکی دەست ڕەنگینە .. فەرش و
قاڵی‌وا جوان‌و سەرسورهێنەر دروست ئەکەن کە هاو تای نیە .

ح ـ بالاشاغی ( Balashaghi )

(٢٠٠٠) خێزانن .. کۆچەرن .

ط ـ میرانـلی ( Miranli )

ژمـارە ی خێـزان نـەزانراوە .. ئـــەزانـم لە دەرسیم‌دا
جێگیربوونەتەوە .. بەڵام لە چ ناوچەیەکدا بـەتـەواوی ئـەوە
نـازانـم .

ی ـ لاچـن ئوشـاغی ( Latchin Uchaghi )

ژمارەی خێزان نەزانراوە .. لە (ئەموگا)دا دادەنیشن .

ك ـ کـوزلیچـان ( Kuzlichan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە ..؟ ئەم ناوە .. قەت لەوە ناچێ
ناوی ڕاستەقینەی هۆزێك‌بێت ... بەڵام چونکە لـــە هەرێمی
دەرسیمدا .. چەندەها خێڵی جوارو جۆر هەن .. ناوەکـەش
کراوە بە ناوی هۆزێك کە لە باکوری ( دیار بەکر )دا جێگیرن
ئەرگەچیش ئەتوانم ئەوەش بڵێم کە ئەمانە ڕەنگە چەن خێزانێکی

کۆچەری ناوچەی دەرسیم بوون لە بنەڕەتداو هاتونەتە ئەم ناوچەیە •

ل ـ گیڤران ( Givran )

وایان پێ ڕاگەیاندم کە ئەمانە لە ئەسڵدا (دەرسیمین) •• بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ من لەم مەسەلەیە بە گومانم •

# بەشی
# ( C )

بـەشـــی ( C )

ئەم ناوچەیە لە ڕاستیدا ••• هەرێمی کـــۆنی جـزیرەی باکوری ئیمپراتۆریەتی خەلیفە عەباسییەکانی بەغـدا ئەگرێتەوەو ئەتوانین لەم ڕووەوە کوردەکانی نیشتە جێی ئەم هەرێمە بـــەم شێوەیەی خوارەوە دابەش بکەین •

١ ـ لقی یەکەم ژمارە (١)و ئەو پیتانەی لەگەڵیادێن •

ئەتوانین ئەلقە بەم چەشنە لای خوارەوە دابەش کەین :

١ ـ هەر لە ژمارە (١) تا ژمارە (١) یەکی ( DX )

٢ ـ هەر لە ژمارە (١) ( EX ) تا ژمارە یەکی ( RX )

٣ ـ لقی دووەم ژمارە (١٥) وئەو پیتانەی کە لە گەڵیادێن

٤ ـ لقی سێهەم ژمارە (١٦)و ئەو پیتانەی کە لەگەلیادێن•

٥ ـ لقی چوارەم •• هەمو ژمارەکانی تر ئەگرێتەوە پێچگە لـە ژمـارە (١٨) •

سەبارەت بە لقی (١)ەم ژمارە (١) ••وەك دیارە زۆربـەی ئەم لقە وەك شەپۆلێك لە دەرسیمەوە بۆ ئەم ناوچەیە باریان پێ کراوە لە سەردەمی حوکمرانی سولتان (سلیم)دا •• ئەوەی جێی

سەرنجە کە ئەمانە لە ڕێی ژنو ژنخوازیەوە لەگەڵ عەرەبو ئەرمەنیو هۆزە کوردەکانی تری ناوچەکە هەروەهاش لەڕێی تێکلاوبوونیان لەگەڵ هۆزە دەراوسێ کانیان ... کەلێ لە دابو نەریتی رەسەنیان لە بیرکردووە • هەرچەندە وەك جوتیار توانایەکی باشیان نەنواندووە بەڵام چێواری چاكو جۆلای دەست ڕەنگینو قەشەنگیان فرەیە •

باری کوزەرانو شێوەی ژیانیان زۆر ئاسانە .. کانونی یەکەمو شوباتو ئازار لە دامێنی دولەکانی چیای تەراجە داغ بەسەر ئەبەن لە مانگی ( نیسان ، مایس )و لە دەشتاییەکانی مزۆپۆتێمیاو لە مانگانی جۆزەردان – حزیران ) و ( کەلاوێژ – تموز و ئاب )و ( ئەیلول )دا بەرەو دیار بەکر کۆچ ئەکەنو لە مانگی – ئۆکتۆبەر ) و ( نۆڤەمبەر ) و ( کانونی یەکەم ) جارێکی تر بەرەو باشورر ئەگەڕێنەوە • تیرەکانی ژمارە (٢)ی ئەم لقە ... ئەمانە خۆیان لەگەڵ میرەکانی ژمارە (١ی) ئەم بەشە بەیەك ڕەگەزو یەك وەچەو یەك ئەسڵ دادەنێن .. هۆێ لە یەکتر برانیان .. ڕووباری فوراتەکە لە نێوانیاندا تێدەپەڕێو دەیانکاتە دوو کەرتەوە ئەمانە یان شیعەن .. یان پەیڕەوی بڕوایەکی ئاینی تێکەڵوپێکەڵو نامۆ ئەکەن ... وەك ئەوەی دەرسیمی یەکان.. ناو ناوێکیش .. چەند پیاوێکی ئاینیی لە دەرسیمەوە دێنە لایان بۆ بە سەرکردنەوەو خوێندنەوەی چەن وتارێکی ئاینی • لە ڕووی جلو بەرگەوە .. لە تورکەکانی باکوری ئەنەدۆڵ .. جیا ناکرێنەوە .. بەهەر حاڵ ژنەکانیان پەچە ئەدەنو پیاوەکانیشیان هیچ جۆرە خاسییەتێکی تایبەتیان نی یە کە شایەنی باس بێت •

لقى دووەم : بە تەواوى بۆم ساغ نەبووەوە ..
کە ئەمانە بە کوردى تەواو ئەژمێرێن
یان نەء .. هەرچەندە .. ئەتوانم ئیدیعای ئەوە بکەم
کە ئەمانە کۆمەلێ رەگەزو قەومى جیا جیا بوون کە دراوسێتىو
بارو دۆخى زەمانە تێکەلّى کردوونو لە ئاستى ڕووداوەکاندا
هاریونىو کردوونى بەیەك رەگەزو یەك بنەچە ، ئەمانە وەك بێتە
پێش چاوم بە ئەسڵ پاشماوەى ئەرمەنىیە کۆنەکانو ڕۆمانىیەکانن
کە لەگەڵ کوردو فارسو مەغولىیەکاندا .. تواونەتەوە •

هەندى لەمانە موسلمانى تەواونو هەندێکیان فەڵەى
یاقوبین هەندێکیان شەیتان پەرستنو ئەوبەشەى ماوەتەوە لە
لایەنگیرانى هەر سێ ئاینەکەن ، بەشیوەیەکى گشتى ئەمانە
پیشەسازو پیاوى کارامەو بەناى چاكو ڕەزەوانى قەشەنگ
یان تێدایە .. هەرچەندە لە لایەکى دیشەوە خۆێنڕێژو پیاو
کوژو جەردەشیان زۆرە •

ئەوەى جێى مەترسىیە بۆ ئەم ناوچەیە ئەوەیە کە
جولانەوەیەکى ئاینى نامۆ خەریکە پەرەئەسێنێو ناوناویش
دەبێتە هۆى ئەنجامدانى چەن ئاکامێکى چاوەڕێ‌نەکراو بە
تایبەتى لە ناو هۆزە گەورەکانى ئەم بەشە کە هەندێکیان لە
پەیڕەوى پرۆتیستانتینزمى ئیڤانگیلین •

لقى سێهەم : ئەو کۆمەلگا ئێزدیە گرنگو گەورەیە
ئەگرێتەوە کە لە ناو خەلکدا بە شەیتان پەرست مەشهورن بە
تایبەتى یەکێتى هۆزانى ناوچەى ژەنگار .. ئەمانە کوردێکى

تەواون لە هەمو ڕوویکەوە بە شانو شەوکەت بە سیماو ڕوالەت ..ئەم ئێزدیانە زۆر لە کوردەکانی دەرسیم ئەچن ... باریکەنەو ئیسقان ووردو چاو گەورەو لێوباریك .. پرچی درێژ ئەهێننەوەو بەسەر شانیانەوە شۆرئەبێتەوە .

جلو بەرگ‌و کەلو پەلی ئەم ئێزدیانە لەوانەی کوردەکانی تر ناچێ ... جلو بەرگیان لە مۆزەخانەی مێژویەکی دێرین هەلقولاوە ..کە بریتی‌یە لە فێسێکی قاوەیی درێژو کراسێکی سپێی تەسکی یەقەو ملیوان داخراو عەبایەك کە لە چەرمی ئاسك دروس کراوە یاخود لەچەرمێکی قاوەیی تەنکەوە سەرەڕای بشتێنێکی چەرم .

وەك ئەگێرنەوە ئەمانە پاش غەزاکەی تەیموری لەنگەوە هاتوونەتە ناوچەی ژەنگار بەهەر حال هەرچەندە دانیش بەوە نراوە کە بیرو باوەڕی ئاینی ئێزدایەتی پێش غەزای ناوبراو بە ماوەیەك لەو ناوچەیە بلاوبۆتەوە

لقی چوارەم : کوردەکانی ناوچەی مێزوپۆتیمیا ئەگرێتەوە

١ - میللی

(٣٠) خێزان ئەبن . ناوی ئەم هۆزە جۆرە دەنگدانەوەیەکی تایبەتی‌و نامۆ هەیە کە بەستراوە بە دەیەها تاقیکردنەوەو پرسیارو لێکۆلینەوەی تایبەتی لەگەلو لە هەمو ئەو کوردانەی کە پێم کرا لەم لاو لەو لاوە پێیان بگەم .. بەلام جێی داخە کە بلێم کەسی وام نەدی . بتوانێ زانیاریەکی تێرو تەسەلم بداتی

لەبارەی هۆزی میللی‌یەوە •• هەندێ ئەڵێن ئەمانە هۆزێکی بەهێزو ئازا بوون بەلام تورکەکان •• لە سەدەی هەژدەهەمدا ••دایان بەسەریانداو تەفرو تونایان کردن ••• بەلام باری سەرنجی تایبەتی خۆمم لە سەر ئەم ڕاستیانەی لای خوارەوە دامەزراندووە یەکەم – ئیبرایم باشا •• گەورەی سەر خێلانی ئەم هۆزە •• ئەگەرچی ژمارەی خێوەتەکانی لە (٣٠) خێوەت تێپەڕ ناکەن ••• بەڵام دەستەڵاتێکی تەواوی بەسەر دوو هەزار خێزاندا هەیە •

دووەم – بەرێزو قەدرێکی بێ ئەندازەوە •• سەیری – ئیبرایم باشا – ئەکرێ لە لایەن قزلباشەکانی مالاتیاوە •• وەك تەنها لەبەر دەست ڕویشتویی بەلکو زیاتر لە بەر ئەوەیە کە سەرۆکی میللی‌یەکانە •

سێهەم – ئەم ئیبرایم پاشایە •• تاکە بێگانەیە کە بێ پاراستن ( حمایە ) لە ناوچەی دەرسمیدا •• هاتو چۆ بکات

چوارەم :– ئەندامانی خێلی شیمزیکی ژمارە (٧٥)ی بەشی ( A ) وەك سەروکێکی بەناو (ئیسمی) سەیری ئەکەن •

پێنجەم :– گوندە سەختو دوورەکانی ناوچەی (ئەنەدۆل)و (ئەرزنجان) ، ئیبرایم باشا بەسەرخێلی گەورەی هۆزەکانیانی ئەدەنە قەلەم ••

ئەوەی ڕاستی بێ •• هەمو ئەو خالانەی سەرەوە جێی سەرسورمانە کە لە بارەی ئەو (کوردا نەن) کە لێرە باسیان لێوە

کراوه •• جونکه زۆر پەرتو بڵاو تێـــکەڵو پێــکەلن •••
هەندێکیان شیعەنو هەندێکیان سونین بەشـــێکیان رافـزینو
بەشێکیان سەر بەهیچ جۆره بڕوایەکی ئاینیی نین جگە لەمەش
ژمارەیەکیان زازان •• سەرباری ئەم بارە شێواوەش ••ئیبرایم
پاشا خۆی سوننی‌یە •• جا لـە بەر ئـەوه ئەتوانین بڵێین ••
دەسەڵاتی ئیبرایم پاشا بەسەر هەمو ئەو هۆزانە نە ڕامیاریـەو
نـە ئاینـی •• لـەگـەڵ ئەوەشدا کـوردەکان لە سـەرانسەری
هەرێمەکەوه •• دێنە لای بۆ رێزلێنانو ڕا وەرگرتنو دۆزینەوەی
چارەسەرکردن بۆ کێشەکانیانو بڕیاری ئەو واتە ـئیبرایمباشاـ
لە سەر هەچ مەسەلەیەك ••• بەدوا بڕیاری پەسەند دادەنێن••
سەرەڕای ئەمەش ژمارەیەکی دیش هەیە لەو هۆزە کوردانە ••
کە هەرچەندە هاوپەیمانن لەگەڵ ئیبرایمپاشا لە کاتی شەرو شوڕدا
••• بەڵام ئەو بایەخەی لە لایان نیە وەك سەر کردەیەکی کورد
•• ئیبرایم پاشاش ئەم بارە بەم شێوەیەی لای خوارەوە باسـی
لێوە ئەکاتو ئەڵێ : سەدەها ساڵ لـەمـەو پێش کـورد بوونە
دووپارچە بەنێوی [ میلان ] و [ زیلان ] •• هەزارو دوو سـەد
هۆز لەوانە میلانی بوون •• چونکە خوایان لێ ڕازی نـەبو و
کردیانی بەدەیەها بەشەوه •• پاشان لەم لاو لەو لادا تەروەنـە
بوون •• بەشێکیان فەوتانو لە بیر چوونەوە •• بەڵام ئەوانەی
کە ماوون ـ وەك ئەیبینن ـ ئەم بە سەرخێلی خۆیان دادەنێن••
ئەم ئەفسانەییە کە ئیبرایم پاشا گێرایەوە لە سەردەمێکی دوورو
درێژدا پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام •• ڕووی داوه • لە

... تریان
(ئیزدی) بوون •• ئەفسانەی میلانییەکان ئەڵێ گوایە خۆیان لە بنەڕەتدا •• وچەی ( سام )بوون ••• کە لە دوور گەی عەرەبیدا جێ گیربوون •• بەڵام زیلانییەکان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتەوە•• هاتونەتە ئەم شوێنە هەر هەمان ئەفسانە لــە ناو کــوردەکانی دەرسیمدا باوە لەگەڵ زیادە دەستکاریەکی کەمدا •• کـە بـەم شێوەیەی لای خوارەوە دەگێردرێتەوە :ـ

کوردەکانی میلان لـە دوور گەی لـە پێشـدا ناوبراودا هاتوون •• بەهەر حال :ـ کــە ســولتان ســلیم رۆژئاوای کوردستانی داگیرکرد •• باری ژیانی کۆچەری کــوردەکــانو جۆلانەوە سەربەستەکەیانی لە دەشتاییەکان دەرسیمدا لە کاتی گەرمیانو کوێستان کردنیاندا ••• هەروەهاش تەشـەنەبوونی کۆچەرە کوردەکان لە سەراپای ناوچەکە •• ئەم مەســەلانـە بـە کۆمەڵ ••• سەرنجی وەزیرەکەی سولتان (سلیم)ی ڕاکێشا بۆیە ئەمیش خێرا فەرمانی دەرکرد کە تێیدا ئەوەی قەدەغە کردو ووتی ••ئەبێ ئەو کوردانە نیشتەجێ بنو واز لە ژیانی کۆچەری بێننو دەست کەن بە ئاوەدانکردنی ناوچەکە لە ڕێ خانووکردنو خەریكبوون بە ئیشو کاری کشتو کالەوە فەرمانەکە زۆر توند بوو •• بۆیە کوردەکان ناچار کران • نیشتەجێ بنو دەست کەن بە ئیشو کــاری کشــتو کــالـی هەنـدێ لــەو کوردانە لەوێجێگربوونو فێری زمانی تورکی بوونو ژنەکانیان فێری پەچەدانبوون بەڵام بەشەکەی تریان ئەم جۆرە ژیانەیان بــەدڵ

ئەبوو ••• بۆیە بۆ دەرسێم هەڵلاتن‌و ئەوانی تریش بەرەو خوار بوونەوە •••، خێزانی ئیبرایم پاشاش لەگەڵ ئەو هۆزانە بوون کە بەرەو خواربوونەوە •

لە لایەکی تریشەوە میلانیەکان بە چاوێکی سەیرەوە تەماشای زیلانی‌یەکان ئەکەن هەرچەندە بە تاقی‌کردنەوە بۆم دەرکەوت کە ئەوەی ئەو میلانیانە ئەیلێن دەربارەی زیلانی‌یەکان زۆر لەوە ئەچێ کە ڕاست بێ چونکە بەرەی دووەم •• زۆر سەرکێش‌و توڕەو دڵڕەق‌و دواکەوتوون •••

ئەم ئەفسانەیە سەبارەت بە من زۆر سەرنج ڕاکێشەرە لەوانەشە خوێنەری بەڕێز سەرسام بمێنێتەوە گەر زانی کە من چەن عەزیەت‌و زەحمەتم کێشاوەو چەن هەوڵ‌و کۆشم کردووە بۆ ماوەی چەند مانگێك لە پێناوی کۆکردنەوەی ئەم پارگرافە بچوکەی سەرەوە •• هەمو کەسێ لەوسەردەمە دانی بەوە دەنا کە ئەستێرەی هۆزی میلان لەگەشانەوەدا بوو •

أ ـ دەنان ( Danan )

(٢٥٠) خێزانن ••• کۆچەرن

ب ـ سەیدان ( Seidon )

(٤٥٠) خێزانن •• کۆچەرن •• هەمان ناومان لە بەشی ( A ) ژمارە (٣٢) و (٧٣) پێش چاومان ئەکەوێ‌و بەشی ( B ) ژمارە( 20F ) بەڵام •• من بەم بۆنەیەوە • ئەڵێم

ڕەنگە ئەم (ناوە) • لە ناوی (سەرکردەیەک) لە ناوی ( سەید ) یان ( سەعید ) بووە وەرگیرابێ •

ج ـ کیـــران ( kiran )

(٥٥٠) خێزانن •• کۆچەرن •• ئیبرایم پاشای ئەوەی پێ ڕاگەیاندم •• کە ئەمانە لـــە رووی دابو رەســـمو نـەریتو رەوشتەوە زۆر زۆر لە ئێزدیەکان ئەچن ڕەنکە هەر لـــە یەك هۆزیش بن ••ئەگەرچیش ئەمان سونین •

د ـ دودیکـانلی ( Dudikanli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە کۆچەرن •• لەگـــەڵ ئیبرایـم پاشان لە باکوری مێزوپۆتیمیاوە •• پێنچ گوندی دیش هـەیە لە نـزیك ڤارتۆوە ( Varto ) کە بەزاری زازا قسـەدەکـەن هەروەهاش ئەڵێن هەندیکیان لە دەرسمین •• بڕوانە بەشی •

هـ ـ خاڵـە جـان ( Khalajan )

(٧٠٠) خێزانێك ئەبن کۆچەرن

و ـ کیلیش ( Kelish )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •• کۆچەرن •

ز ـ مینـــدان ( Mendan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن •• تیرەیەکن لـــە هۆزی ژمارە (١) • جا نازانم بە تەواوی گەر ئەمانە لە (هەرکی) یەکانی ژمارە (٣٢) بەشی ( A هاتوونەتە (قەراجە داغ)ەوە یان

به پێچەوانەوە •• ئەم مەسەلەیەم بە تەواوی بۆ ساغ نەبووەوە •

ـ کومناریش ( Kumnaresh )

(٣٥٠) خێزانن •• کۆچەرن

ط ـ شیریکیان ( Sherikar )

(٨٠) خزانن • کۆچەرن

ی ـ ئیل کەوات ( Flkawat )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن

ك ـ داشی ( Dashi )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن •

ل میشکێنلی ( Meshkenli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن •

م ـ کالیندیلان ( Kalndelan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە ••

س ـ حاجی بەیرەم ( Hajji Bairam )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن •

ص ـ حەسەنی‌یەکان ( Hassanekan )

(٢٦٠) خێزانن • کۆچەرن • ئەمانە پەیوەندیان بە هۆزی حەسنانلی‌یەوە نی‌یە کە هیچ گومانی نی‌یە کەوالە عەشرەتی (زیلان)ن•

ض ـ خـاله جـارى ( Khalajari )

(٧٠٠) خێزانن • كۆچەرن

ع ـ ئيليــا ( Elia )

ژمارەى خێزان نەزانراوە •• كۆچەن

غ ـ ئيســادات ( Isiadat )

(٨٥) خێزانن •• كۆچەرن

ـ تيركـان ( Terkan )

(٧٠٠) خێزانن • كۆچەن

ـ ناسـريان ( Nasrian )

(٧٥) خێزانن • كۆچەرن

ـ چـوڤان ( Tchuvan )

(٢١٠) خێزانن • كۆچەرن

ـ سـارتـان ( Sartan )

(٨٠) خێزانن كۆچەرن : له نزيك (سەرچاوە) وە كه پێى ئەڵێن (راس العين)ەوە •• جى گيربوون

ـ ئوسـباخـان ( Usbakhan )

(٧٠) خێزانن • كـۆچـەرن

ـ مـاتميـه ( Matmieh )

(٨٠٠) خێزانن • كـۆچـەرن

ـ چیمیکـان ( Chemikan )

(٢٥٠) خێزانن • کـۆچـەرن

ـ بارگوهـان ( Barguhan )

١٣٠ خێزانن • کۆچـەرن

ـ هیسـولیـە ( Hisulieh )

(٥٥٠) خێزانن • کۆچەرن

ـ چیا رەش ( چیاریش ) ( Chiaresh )

ژمارەی خێزان نەزانراوە • کۆچەرن

ـ زیـروفـکان ( Zirofkan )

(٢٠٠٠) خێزانن • نیمچە کۆچەرن لـە نزیك قەراجەداغەوە جی‌گیربوون •

ـ داغ باشـی ( Daghbashi )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• هۆزێکی نیمچە کۆچەرن •

ـ هوشـیان ( Hashian )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• کۆچەرن •

بێسیکی ( بۆزکی ) ( Beiziki )

(٨٠٠) خێزانك ئەبن • لەبەر شۆخو شەنگی‌و قەد باریکی •• پییان ئەڵێن [بێسکی] ـ وەرگێر ـ دیارە •• نیشتەجێن •• بەڵام ئەفسانەیەکی سەیرو سەمەرە لە بارەی ڕەچەڵەکیانەوە هەیە

که ئەڵێ گوایە ئەمانە بە ڕەگەز ڕەنگە ئینگلیز یان فەرەنسایی بن
ناز ناوی دێرینیان [سالارگان] بووە ••

ئەشتوانم بەڵام بێ دڵنیاییەکی ئەوتۆوە •• ناوی ( لوسی
گینان ) ( lusignan ) بهێنم •• جاوەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ
ئەم کێشەیە ئەڵێم •• جارێکیان یەکی لەم بنەماڵەیە لـەگـەڵ
بێسیکیەکانـدا •• ئاڵو گـۆڕیان کردووە یاخـود وەك
پەناهەندەیەك •• لـە خێوەتەکانیاندا •• میوان بووە •

- حاجی مانلی ( Hajji Manli )

(٥٠٠) خێزانێك ئەبن • کۆچەرن ••

- کاسـیانی ( Kassiani )

(٥٠٠) خزانێك ئەبن • نیشتەجێن

- چـەکـالی ( Chakli )

(١٠٠٠) خێزانێکن • نیشتە جێن •

مێردیس Merdis )

(١٠٠٠) خێزانێك ئەبن • پێم وایە نیشتەجێن •

- یوتیر گیـچ ( Eutergech )

ژمارەی خێزان نەزانداوە •• کۆچەرن

- جان بێـگ ( Janbeg )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• نیشتەجێن •• دیارە لقێکن

لـە ژمارە (١٨)ی بەشـی ( F )

ـ بەی‌لیان بۆرگـا ( Beyleyanparga )

(٥٠٠) خێزانن نیشتەجێن

ـ دیـریجـان ( Derejan )

(٨٠٠) خێزانن • نیشتەجێن

ـ کـاو ( قاو ) ( Kao )

(٥٠٠٠) خێزانن • نیشتەجێو کۆچەرن

ـ مولیکـان ( Mulikan )

٥٠٠ خێزانن • نازانم ئەگەر ئەمانە کـۆچەر بـن یـان نیشـتەجێ

ـ دیـری جـان

ژمارە خێزان نەزانراوە •• لەوانەیە لقێك بن لە ژمـارە (١٠)×ی بەشـی ( C ) یان بەلای کەمەوە • هاوینە هەواری ئـەو هـۆزە بـن •

٢ ـ قـەرەجیـچ ( Karagetch )

(١٧٠٠) خێزانن • ئەمە ناوی هۆزێکی نیمچن کۆچـەرە کە لـە دەوروبەری (سیڤیریك)دا •• پەرت‌و بڵاوە ئەم خێڵـە گەجەرو گوجەری زۆرە •• پیاو کوژو دواکەوتوو خوێن‌رێژو پیس پۆخل یان تیایە •• ڕێبوارو گەڕیدە پێگانەکانە••هەمیشە باسی ئەمانە ئەکەن وەك خاڵێکی تاریك لە ڕوخساری بێ گەردی ناوچە کوردستان‌و هۆزە کوردەکان •• جونکە لە بەرزاییەکاندا

گیرساونەتەوە •• هەر خەرێکی چەپاو تالآنـکردنـی خـەڵكو هۆزەکانی دەوروپشتیانن •• جا بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە نامۆتر بێ •• ژمارەیکیان بەزاری زازادا ئاخەفتن ئەکەن ســەرەڕای ئەمانەش ••• لە نێوانی (دیار بەکر) و (نور عابدین)دا ژمارەیەکی گەورەتر هەیە لەو کوردە بێ سەرو بەرانەی کە سەر بـە هیـچ هۆزێک نین •• کە دیــارە لە هۆزە ئەسڵدیەکــانیان دوور خراونەتەوە یاخود دا بچراون •• جا لە هەموی سەیر تر ئەوەیە کە نابوترین بەشی لەو حەز لــە چارەنەکراوانە •• خۆیان بـە ( قەرەچیچ )ی دادەنین ئەوەی ڕاستی بێ ئەم (قەرەجیجانە) لە بنەڕەتدا هۆزێکی تورکمان بوون لە خۆراوای ئەنەدوڵدا پەرتو بڵاوبون ••• بەڵام ئیتر ئەوە بوو کە وادی خۆی ( ســولتـان ســلیم ) بە زۆر لە نزیك چیای قەراجەداغەوە •• دایانی کـوتا ••• مەبەستی ئەو گواستنەوەیەش ئەوە بوو کە دیموگرافیەتی ناوچەکە کەمە کەمە بگۆڕین بۆ زیادکردنی ژمارەی تورکەکان لەناوچەکە ئەو قەرەجیجانە •• خێراو لە ڕیژنو ژنخـوازیـەوە لەگەڵ ئەو کوردانە کە لە هۆزەکانیانادا بچرابون تێــکەڵاو بــوون ••

جونکە نەخوێنەوارو ئۆمی بوون ••• زوو زمانەکـەیـان لە بیرچووو بوون بە کوردێکی تەواوەوە لە هەمو ڕوویەکەوە••

جگە لەمەش •• لە سەرەتای نیشتەجێبیاندا لەو ناوچەیـە بۆ چەن ساڵێك لە لایەن میری تورکەکانەوە یارمەتی یان ئەدرا پاراستنیان بۆ دابین ئەکردن •• لەبەر ئەو هۆیانە ژمـارەیەکی

باش لەو خێزانە کۆچەرەکوردیانە لە ناوچەی قـەراجـەداغ ••
هاتنــە ناویانەوەو لەگەلیاندا تێکەڵ بوون ، ئەم شتەش خـۆی
لە خۆیدا •• بوو بە هۆی زوو لە بیرکردنی زمانی ســـکماکی
خویان •• واتە (تورکی) •• بۆ ئەوەی ببنە کوردێکی تەواو••

٣ – بونیســـی [ Bunesi ]

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •• پێم وایە ئەم هۆزە هیچ
بووێکی ڕاستەقینەی نی یە • بەلام جونکە گەریدەکان ناویان
هێناوە •• منیش بەش بە حالی خۆم خستمە ناو لیستە هۆزەکانی
ئـەم بەشــەوە •

٤ – میرســـینان [ Mirsinan ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• هیچ شتێکی تـایبەت بـەم
خێڵەم دەست نەکەوت •

٥ – زازا دابچڕاوەکـان [ Non-tribalzazus ]

ئەمانە سەر بە هیچ هۆزێك نین •• بۆ زانیاری ئەبێ ســـەیری
ژمارە (٢٣)ی بەشی ( B ) بکەین •

٦ – شێك سین ( شێخسێن ) [ Chaikessen ]

ژمارەیخێزان نەزانراوە ؟

٧ – بـارهـــان [ Barhan ]

ژمارەی خێزان • نەزانراوە

٨ – ئـەبو تـاهیر [ Abutahir ]

ژمارەی خێران نەزانراوە ••

ئەمانە ئەڵێن گوایە بە نەژاد عەرەبن هەرچەندە بە کرمانجی ناحەفتن دەکەن •

٩ - گیڤـران [ Givran ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە • تیرەیەکن لە ژمارە(١)

١٠ - ئـەمیر زان [ Eimerzen ]

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •• بەڕاستی -بەلای منەوە- بوونی ئەم هۆزە جێی گومانە •

١١ - کیکی وچیچیە کیکیە

(Chichieh) (Kiki) , (Kikieh)

(١٢٠٠) خێزانیك ئەبن • هۆزێکی کوردی نیمچە کۆچەرە ئێستا ••• زستان لـە گوندەکانیان کـە لـە بـاوەشـی تەراجە دانیوەن •• ئەبەنە سەرو بەهاران بەرەو خوار ئەبنەوە •• بۆ سەر ڕۆخی ••• ڕوباری جاغ - جاغ هـــەر لەوێش ئـەمێننەوە تـا سەرەتای هاوین • سەر خێڵەکانیان ئەڵێن گـــوایە لە نـەوەی شـازادەیەکن کە وادی خۆی خەلیفە عەباسی‌یەکانی بـەغـدا •• ناردویانەتە •• ناوچەکە بۆ بەڕێوەبردنی کارو باری ناوچەکە • بەڵام کە ڕۆژی عەباسی‌یەکان بـەرەو ئاوابوون چوو •• ئـەو شازادەیەو خێزانەکەی هەر لە کوردستان مانەوە •• لـە پاشان •• هـۆزی ( کیکی ) کورد •• کردنیانە سەرۆکی خێڵەکەیانەوە ••• بەدوەکانی ئەو شوێنە بەچاوی ڕێزو قەدرەوە تەماشـایـان ئەکەن •• هەرچەندە ئاغاکانیان بە چاوێکی سووکەوە سەیری

ڕەعەیەتەکانیان ئەکەن‌و پییان ئەڵێن [سەگەکانی کورد] •• پێم وایە ئاغاکانیان لە بۆرە پیاوانی خێڵەکە ژن ناهێنن ••سەرخێڵ‌و دەم چەرمگی ئەم هۆزە •• عبدالرحمن ئاغایە •• کە پیاوێکی خوێندەوارو دنیا دیدەیە •• سەرباری ئەمەش •• ئەو (عبدالرحمن ئاغا )یە •• هەولێکی زۆرداو کوششێکی زۆرتری کرد لە پێناوی دەستنیشانکردنی شارە کۆنە مێژوییەکانی •• قەراخەکانی ئـەم بەرو ئەوبەری ڕووباری خابور •

عبدالرحمن ئاغا لەو بڕوایەیە کەوا ••• هـۆزی کیـکی پاشماوەی دانیشتووە کۆنەکانی ناوچەی (جزیـرە)ن•کە وادی خۆی هۆزی شەمەری عەرەبی ڕاوی‌نان‌و بەرەو باکور ڕایـانی ماڵی •• کەبەرەو باشور دێن •• تەنها بە نیازی•• خۆپیشان‌دان دێن‌و بۆ ئەوەی ئەوە سەلمێنن کە خاوەن مافن‌و ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەبێ ئەو هەلەیان بۆ بڕەخسێ بۆ گەڕانەوەو سەر لەنوێ لوێدا جێگیربنەوەو وخـۆیـان بـە ئیش‌و کـاری کشت‌و کـالێ •• خـەریك بکـەن •

١٢ - داخـوری [ Dakhori ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە ••• ئەمانە (شەرنەخ)ن‌و لەدێوە •• هاتونەتە ئەم ناوچەیە •

١٣ - هەسـیران [ Hasseran ]

ژمارەی خێزان نەزانراوە •؟

١٤ - سـورکێشلی [ Surkishli ]

(٩٠٠) خێزانن •• نیشتەجێن •• ئەڵێن ئەمانە بە شێوەی کوردەکانی ناوچەی ( بابان ) ئاخەفتن ئەکەن •• ئەگەر وابێ •• لە وانەیە پەیوەندیان بەهۆزی سورچی ژمارە (٩)ی بەشی ( A ) وە هەبێ •

١٥ - • • • • •

لەژێر ئەم ژمارەیە ••• موسڵمانو ئێزدیو گاورەکانی ناوچەی ( نور عابدین )م ڕیز کردووە •

أ - ١٦- مزیزاخ [ Mizizakh ]

(٣٩٠) خێزانن لە ( نور عابدین )دا نیشتەچێن •• کوردنو موسڵمانن •

ب - ساعور ( Saur )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• لە (نور عابدین)دا جێگیربوون• هۆزێکی بێسەرو بەرە •• تێکڵاوە لە موسلمانو گاور کە بەعەرەبی ئاخەفتن ئەکەن •

ج - ماهەلامی ( Mahelami )

(٨٠٠) خێزانن •• بە عەرەبیەکی شکاوە ئاخەفتن ئەکەن ژنەکانیان هەمیشە جلی سور ئەپۆشن •• پەچەش نادەن ئیبرایم پاشا پێ ڕاگەیاندم ••کە ئەم هۆزە تێکەڵە لە عەرەبو کورد•• ئەڵێن •• ژمارەیەکیشیان هەر هێشتا لە سەر ئاینە کۆنەکەیان ماونەتەوە •• واتە هەر گاورن •

د ـ هارونا ( Haruna )

(٧٥٠) خێزانن •• هۆزێکی کوردی نیشتەجێیە •• تەنها (٩٠) خێزان لە مانە گاوری یاقوبین •

هـ ـ دیل مامیکان ( Delmamikan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• لە نورعابدین سەقامگیربوون یە عەرەبی یەکی شکاوە ئاخەفتن ئەکەن •

و ـ دومانە ( Domana )

(١٨٠) خێزانن •• لە نورعابدین نیشتەجێن •• گاورو موسلمانن •

ز ـ دورکان ( Dorkan )

(١٢٠) خێزانن •• لە چیاکانی نورعابدین‌دا نیشتەجێن موسلمانو ئیزدیان تێدایە •

ح ـ مومان ( Moman )

(٦٠٠) خێزانن •• موسلمانن بە کرمانجی ئاخافتن ئەکەن ••(٩٠) خێزانو سێ سەرخێلیان گاورن •

ط ـ هەڤێرکا ( Haverka )

(١٨٠٠) خێزانن •• نیوەیان موسلمانو نیوەکەی تریان گاور •• بەکرمانجی ئاخافتن ئەکەن •• لەو بڕوایەدام کە ئەمانە جۆرە پەیوەندیەکیان لەگەڵ هۆزی (هەوێری) ژمارە (٤٨)ی بەشی ( A ) ئیزدیا هەیە •

ی ـ سالاهان ( صالحان ) ( Salahan )

ژماره خێزان نەزانراوە

ك ـ گەرگـەری ( Gargari )

(٥٠٠) خێزانن •• لە ناو خێـوەتو دەواردا ئـەژین •• خەریکی کشتو کاڵن بە کرمانجی دەئاخەفن •• ئەڵێن ئەمانـە بەنەژاد عەرەبن •

ل ـ داسـیکان ( Dasikan )

(٩٠٠) خێزانن •• ئیزدیو موسلمانو گاوریان تێدایە •

م ـ ئـالیـان ( Alian )

(١٢٠٠) خێزانن •• گاورو موسلمانو ئیزدیان تێـدایە بە کرمانجی دەئاخەفن ••وەك زانیم •

ص ـ میزیداغ ( Mizidagh )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •• بڕوانە ژمارە (١٥) بەش ( A )لەو بڕوایەدام کە ئەمانە بەشێکی کۆچەرن لە ژمارە (١٥)ی بەشی ( A ) کە لە تەکیانەوە جێ گیرن •

١٦ ـ ئیزدیـەکانی سـنجار

أ ـ بـۆمتێـوت ( Bumteywit )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• هۆزێکی عەرەب نەژادن •• لە بارێکی کۆیلەییدا لە ژێر دەستی ئیزدیەکانی سنجار دا ئەژین

ب ـ میـرکـان ( Mirkan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• نیشتەجێن •

ج ـ سـامۆگـه ( Samuga )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• لە خێوەتو دەواردا ئەژین ... لە نزیك سنجارەوە •• لەو باوەڕەم ناوی هۆزەکەیان لـە ناوی ئەو شوێنەی کە تیێدا جێ گیرن وەرگیراوە •

د ـ بیت الخـولتـه ( Beibel-Khulta )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• جێ گیرن

هـ ـ حەبـابـه ( Hababa )

ژمارەی خێزان نەزانراوە ـ نیشتە جێن •

و ـ کـیران ( Kiran )

ژمارەی خێـزان نەزانراوە •• ئەمانە لە خێوەت لە دەواردا ئـەژین لـە نـزیك سـنجارەوە •• هەندێ لـەم کیرانەش •• موسڵمانن •• سەیری ژمارە (١)ی بەشی ( C ) بکە •

ز ـ بـەلـەد ( Beled )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە

ئەم ئێزدیانە نیشتەجێن لە شارۆچکەی (بلد سنجار)•• دیارە دیارە ناوەکەشیان هەر لەوەوە هاتووە •

ح ـ بیـکران (Bekiran)

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •؟ نیشتەجێن •• لەوانەیـە ئەمانە بەشێك بن لە (بیکریانەکانی) نزیکی دیاربەکر •

ط ـ میندیکـان (Mendikan)

(٣٠٠) خێزانێك ئەبن • هۆزێکی ئێزدی کۆچەرن لـە نێوان ( تلعفر ) و ( سنجار )دا هاتوچۆئەکەن •• ژمارەیەك لەم میندیکانانە •• موسڵمانن‌و لەگەڵ ئێزدیەکاندا تێکەڵ نابن لەڕی ژن‌و ژنخوازیەوە •

ئەوەی ڕاستی‌بێ نەمتوانی لەوە دڵنیابم گەر ئەمانە عەرەب بن‌و تازەکی لەگەڵ میندیکانەکاندا•• ئاوێتەبوون•• یان نەء بەهەر حاڵ ئەمانە باشترین پەیوەندیان لەگەڵ برا شەیتان پەرستەکانیانـدا هەیە • قەشە (چامیك) لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئەرمینیا ) نـاو بەناو باسی میندیکانەکانی کردووە •

١٧ ـ ئـالـوش (Alush)

(٢٠٠) خێزانن • هۆزێکە کە لە دەرکراوو دوورخـراوو پەناهەندە پێکهاتووەو لە ژێر دەستەڵاتی سەرخێڵێکی (کورد)ن ••بەلاّم بەزمانی عەرەبی دەئاخەفن •

١٨ ـ بیرازیـــە [ Berazieh ]

(٩٠٠٠) خێزانن بەشـێك لـــە بیرازیانلی‌یانەی ژمـارە ( ٦ A )ی بەشـی ( d )نکـە لـە سەرووی مێزوپوتیمیاوە هاتونەتە ناوچەی (سیروج)ەوە •• لە کاتێکی نادیاردا •• ئـەم یەکێتیە هۆزانیە لەم خێڵانەی لای خوارەوە پێکهاتووە ••

| خێـڵ | ژمارەی خێزان |
| --- | --- |
| ١ ـ کیتکـان | ٧٠٠ خێزانـە |
| ٢ ـ شیخان | ٦٠٠ = |
| ٣ ـ اوکیـان | ٧٠٠ = |
| ٤ ـ شادادان | ٧٠٠ = |
| ٥ ـ ئەلی دنیلی (علی دنیلی) | ٧٠٠ = |
| ٦ ـ مأفـان [ مەعافان ] | ٧٠٠ = |
| ٧ ـ زیروان | ٥٠٠ = |
| ٨ ـ بیجـان | ٨٠٠ = |
| ٩ ـ کەراجیچان | ٥٠٠ = |
| ١٠ـ دنیـان | ١٠٠٠ = |
| ١١ـ مـیر | ١٠٠٠ = |
| ١٢ـ دیـدان | ٣٠٠ = |

ئەوەی ڕاستی بێ •• تێبینی کردنی ناوی (هۆزی قەرەجیج) لەم لیستەیە قەت ئەوە ناسەلمێنێ کە زۆربەی ئەم هۆزانەی کـە لـەم یەکێتی یەدا جێیان بۆتەوە •• مێژووی جێگیربونیـان لەم ناوچەیە ئەگەڕێتەوە بـۆ قۆناغەکانی دوای حوکمرانی سولتـان ( سەلیم ) •• ئەوەی لە تێویاندا باوە ••کە ئەمانـە •• لـە دەوروبەری دەریاچەی وانەوە کۆچو ڕەویان هاتوتـە ئـەم ناوچەیە •• لە سالی گرانیەکەدا •• ژمارەیەك لـەم هـۆزانـە

ئێستەبوون بەعەرەبو جلو بەرگی عەرەبی ئەبۆشنو بە زمانی عەرەبی قسەئەکەن •• هێنـدیـکیشیان کـۆچەرن هەندێکیش نیشتەجێو ژمارەیەکیشیان نیمچە کۆچەرن •• ئەم یەکێتی یـە لە ناو کوردانیدا زۆر بەد ناوە •• جونکە دزو جەردەو ڕێگریاز زۆرە •• بەلاَم لەگەلْ ئەوەشدا زیرەکو پیشەسازن •

## (D)

١ - پێنجینان ( Penjinan )

ژمارەی خێـزان •• نەزانراوە •• کۆچەرن •• هاوینـە هەواری ئەم هۆزە چەن گوندێکن لە دەوروبەرەی ناوچەکە••• بە خۆیان ئەڵێن پێنچینان ••• بڕوانە ژمارە (٢)ی بەشی ( B )

٢ - سـیلوکان ( Silulukan )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە

٣ - چـوکورلی ( Chukurli )

ژمارەی خێـزان نەزانراوە ؟

٤ - ئـەزلی ( Azli )

ژمارەی خێزانـنە زانراوە ••

٥ - لولانـلی ( Lolanli )

(٤٨٠) خێزانن •• شیعەن

٦ - حەسـانلی ( Hassanali )

(٣٣٠٠) خێـزانن •• هۆزێکی گـەورەیـە (١١٠) دیـان هەیە لە ناوچەی [خینیس] ( Khinis ) ، میلاسـگرد

( Milasgird ) و ڤـارتـو ( Varto ) •• هەندێ لـە ئەندامانی ئەم هۆزە •• گەرمیانو کویستانیان ئـەکـرد بـەڵام لەم ساڵانەی دواییەدا گیرسانەوە کەمە کەمە وازیان لە ژیـانـی نیمچەکۆچەری هێنا •• ئەم هۆزە پۆشتەو پەرداغە •

٦ ( أ ) بیریزانلی ( Berizanli )

(٩٠٠) خێزانن ••• ئەمە تیرەیەکە لە هۆزی (حەسەنانلی) ••کە هەمویان ئێستە نیشتەجێن •

٧ ـ ئایسـولی ( Isoli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• هـەندێ لەمانە لـە نـزیـك دەریاچەی (وان)ەو •• جێگربوون •• لەوانەشە ئەمانە بەشێك بن لە هۆزی (هیسولبە)ی ژمارە ( I Ax ) بەشـی ( C )

٨ ـ جبـرانـلی (Gibranli)

ئەمە هۆزەو یەکێتیەکی هۆزانی‌یە لە هەمان کـاتدا • کە بریتی‌یە لەم هۆزانەی لای خوارەوە ••

أ ـ مـوخیـل ( Mukhel )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە

ب ـ عەرەب ئـاغـا ( Arah Agha )

ژمارە خێزان نەزانراوە

ج ـ تـوریلی ( Torini )

ژمارەی خێزان نەزانراوە

د ـ ئـەلیـکی ( Aliki )

ژمارەی خێزان نەزانراوە

هـ ـ ئەسـدینی ( Asdini )

ژمارەی خێزان نەزانراوە

و ـ شێخەکـان ( Sheykhekan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە

ز ـ مامەجـان ( Mamagan )

ژمارەی خێزان نەزانراوە

لەوانەیە لەگەڵ هۆزی (مامە خانلە)دا خزم بن کە ژمارەیان

( 9.A ) ە لەبەشی ( C ) دا

ح ـ شادیرلی ( Shaderli

ژمـارەی خێـزان نەزانراوە •• شیعەن لە ژمارە (٦) ی

بـەشـــی ( E ) •• دابچڕاون •

ط ـ بیلیکـان ( Bellikan )

(٦٠٠٠) خێـزانـن •• کـــوردی زازان •• شـــیعەن

٩ ـ سـپیکانلی ( Sipikanli )

(٣) هەزار خێزانێك ئەبن •• ئەمە هۆزێکی سەرەکی‌یە لە سەرووی دەریاچەی (وان)ەوە نیشتەجێ‌یە •• هەروەك ( هۆزی حەیدەرانلی ) ئەمانیش کە لە ڕەق و ملهوڕن •

٩ (أ) - مامه کانلی ( Mamakanli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• ئەمانیش بە تیرەیەك لە هۆزی سپیکانلی ئەدرێنە قەڵەم •• هەندێ کەس ئەمانە بە پاشماوەی ماما گونی‌یە دیرینەکانی مێژووی ئەرمەنی‌یە کۆنەکان دادەنێ •

١٠ - زیریکـانلی ( Zirikanli )

(٦) هەزار خێزانێك ئەبن • لە هەمو ڕوویەکەوە ئەمانە لە هۆزی (جبرانلی) ئەچن کە ژمارە (٨)ی بەشی ( D ) ن •
هەرچەندە ئەمە خۆی لە خۆی‌دا ••• هۆزێکی سـەربەخـۆیەو هیچ لق‌و پۆیەکی نی‌یە وەك بـزانـم •• هـەروەهاش لـەوەش دڵنیانیم •• کە ئەمانە خـۆیان بەڕەچەڵەك بـە ( ناوچـەی عەرەبستانەوە ) واتە [ دیاربەکر ] ببەستنەوە یان نەء لە پێشدا ئەمانە نیشتەجێ نە بوون •• بەڵام لەم (دە) سـاڵەی دواییەدا دەستیان لەژیانی کۆچەری هەڵگرت •

١١ - ڕەشـوان ( Rashwan )

(٧٠) خێزانێك ئـەبن

١٢ - بێزیکلی ( Bazikli )

(٧٠) خێزانن • کۆچەرن

١٣ - بویتنکانلی ( Putikanli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• لە نزیك ( قیغی ) یـەوە •• نیشتەجێن •• بە کرمانجی ئاخافتن ئەکەن •

١٤- گەردی ( Girdi )

دیارە ئەمانە لەژمارە (٧)ی بەشی ( A ) ەوە کۆچیان بـۆ ئەم ناوچەیە کردووە •

١٥ - پیسـیانلی ( Pisianli )

(٧٠٠) خێزانێکی نیشتەجێن بە کرمانجی ئاخەفتن ئەکـەن

١٦ - شـیخ بزەینـی ( Shaykh Bezaini )

(٤٥٠) خێزانن دوو یان سێ گۆندیان لە نزیك ئەرزرۆمەوە هەیە •• دیارە ئەمانە لە ژمارە (٣)ی بەشی ( A ) ەوە••• بۆئەم شوێنە کۆچیان کردووە •

١٧ - زیـلانـلی ( Zilanli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە ؟

١٨ - بـەدیـلی ( Badeli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە لە دەوروبەری ئالاش گێردەوە •• جێ گیربوون • شیعەن •

١٩ - شـادیرلی ( Shaderli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• شیعەن ژمارەیەکیشیان لـە دەوروبەری ئالاش گیردەوە پەرتو بلاّون•

٢٠ - باشـمانلی ( Bashmanli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• ئەمانە عەینی ژمـارە (٥٦)ی

بەشی ( ٨ ) ن • ئەلێن ژمارەیەکی کەش لە مانە لە ئێراندا جێ گیربوون •

٢١ ـ حەمدی کان [ حەمدیخان ] ( Hamdikan )

ژمارەی خێزان •• نەزانراوە •

٢٢ ـ مانۆرانلی ( Manuranli )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •

٢٣ ـ حەیدرانلی ( Haideranli )

(٢٠) هەزار خێزانن •• ئەم هۆزە گەورەترین هۆزە لەم هەرێمەو لە نێوان (موش)و (ورمێ)وە گیرساوەتەوە •• دیارە ئەم هۆزە •• هۆزێکی دواکەوتوو ملهوڕە •• کە هیچ جۆرە حاسیەتێکی تایبەتی تێدا بەدی ناکرێ •• کە شایەنی باسکردنی بێت •

٢٤ ـ آدامانلی ( Adamanli )

(١٨٠٠) خێزانێکن •• ئەمانە نیمچە کۆچەرن •

٢٥ ـ ئێزدی ( Yazodis ) [ یازودیس ]

من : بەڕاستی •• نەم توانی •• ناوی ڕاستەقینەی ئەم خێڵە بدۆزمەوە •• کە بە [شەیتان پەرست] مەشهورن •

١ ـ کوریشلی ( kureshli )

(٢) هەزار خێزانن •• بە کرمانجی دەئاخەڤن •• شیعەی ڕافزین ••• ئەم کوردانەی سەرەوە •• بەتەواوی لەوانەی

لەپێشەوە باسمان کردن •• جیاوازن •• ئەمانە زۆر قۆزو شۆخ و شەنگ‌و لەسەر خۆن •• لەوەش ناچێ ژیانی کۆچەریان بەدڵ بێت ••• بۆیە لە گوندی باشی باشی‌و ئاوەدانکراودا جێگیربوون •• هەر چەندە لە پشت پەردەی ئەو ڕوخسارە هێمەن‌و لەسەر خۆو بێ‌دەنگە •• لە وانەیە سروشتێکی نامۆی نارەحەت خۆی حەشاردا بێتەوە ••• کە هیچ لە سروشتی کوردەکانی تردا جیاواز نەبێ •• لەگەڵ ئەوەشدا •• ئـەمانە جـوتیـاری کـارامەن‌و ئیش‌وکاریان بەباری سەرنجێکی فەلسەفی قوول ئەپێچنەوە••• ئەم خاڵەی دوایی بەڕاستی سەرنج ڕاکێشەرە جونکە ئەمانـەی •• لەسەرەوە •• باسکران •• نە خوێندەوارن •• خاڵێکی‌کەش هەیە کە جێی سەرنجە لە بارەی ئەم هۆزانەوە ئەوەش مەنگی ڕەوشتیانە •••• کورد هەموی •• وایە •• ڕۆخسارێکی هێمن‌و بێ‌گەرد •• کە لەڕاستیدا پەردەیەکە سروشتی ڕەق‌و سەرکێشی‌و یاخی‌بوونەکەیان •• ئەشارێتەوە ••

أ - بالابـرانلی ( Balabranli ) بچووك

(٦٠) خێزانێك ئەبن •• ئەمانە بەناو شیعەن لەسەر ڕۆخی ئەوبەری روباری فورات سەقام‌گیرن ••• ئەوەی جێی سەرنج بێ لە بارەی ئەمانەوە ئەوەیە کە بە شێوەی کرمانجی دەئاخەفێن•• ئـەم هـۆزە زیاتـر لـە هـۆزی ( بـەدیلی ) ژمارە ( I D ) بەشی ( E )

وە نزیکترن وەك لەوەی لە [ دیرسلیمی ] یەکانەوە •• نزیکین•

ب ـ بالآبرانلی مەزن ( Balabranli )

(٥٠٠) خێزانن .. لە خوارووی ئەرزنجانەوە جێ گیرن.. ئەمانە بەشێوەی (زازا) ئاخافتن ئەکەن .. بەناو شیعەن بەلام دیارە غەیرە دینن .

جـ ـ شادیرلی ( Shaderli )

(٣) هەزار خێزانێك ئەبن .. شیعەن بەناو .. بەلآم غیرە دینن لە ڕاستیدا .. لە گەلێ ڕووەوە لە هۆزی (کوریشلی) ئەچن .. هەرچەندە لەوانە پلەیان نزمترە لە بارەی باری کۆمەلآیەتیو ئابووریەوە .. لە ژێرخاندا .. ئەژین .. ئەمانە جوتیاری **هەژارن** .

د ـ بەدیلی ( Badeli

(٧٠٠) خێزانن .. شیعەن ..یان نیمچە کۆچەرن ..ئەڵێن هەندێ لەم بەدیلیانە لە نزیك ڕەواندووزە جێ گیرن .

کۆچکیری ( قوچکیری ) ( Kochkiri )

(١٠٠٠٠) خێزانن .. ئەم هۆزە .. زۆر نامۆیە .. یاخود لەوانەیە بتوانین بە میللەتێکی جیایان دابنێین .. بەسیماو ڕواڵەتو دەمو چاوو هەڵس وکەوت .. گەلێ لە کوردەکانن.. جیاوازان شۆخو جوانو ڕێك وپێکن .. زمانەکەیان کوردیە .. ئەگەرچی کوردەکانی بەبە یا زازاکان بە ستەم لێیانحالی دەبن وەك ئائینیش .. سروشت پەرستن .. واتێ دەگەم سروشت وەك هاوسەرێك بۆ خوا دادەنێن .. ئایینی ئەم هۆزە جۆرە

[ غیره دینیەکی ]پێش کەوتوە •• کەوا ئەڵێم زانیاریەکەم لـەم بارەیەوە لە کۆمەڵێ پیاو ماقولو زانا وەرگرتوە هەرچەندە •• باری ئابوریان وەك جوتیار لاوازەو خـانووەکانیان ژێـرخـان ئاسانو زۆر لە خانوەکانی ناوچەی موشیو سەرووی دەریاچەی (ڤان)ەوە •• ئەچن •• بەڵام ژیانێکی سەربەست ئەبەنە سەر •

راستییەکی کەش •• هەیە کە زیاتر باری نادیـاری ئـەم کۆچکیریانە نامۆ ئەکات ئەوەش •• ئەوەیە کـــە موسـلمانو ئەرمەنییەکانی • ناوچەکە •• لە خانوی بەردی ڕێكو پێـكدا ئـــەژین •• ئەوانیش لەو ماڵە •• ژێرخان ئامێزانـە •• ژیـــان ئەبەنەسەر کە باسی مێژوری خێڵەکەیان ئەکەن •• قوچکیریەکان ئەڵێن ••

ئێمە لە بنەڕەتدا لە ناوچەی دەرسمیدا •• گیرسابونیەوە •• بەڵام خێڵە چیاییەکانی ناوچەکە ••• دایان بەســـەرمانداو بەزۆر ئێمەیان لە ناوچەکـــەی خۆمان •• هـەڵکەند •• کـــە ناوچەیباوكو باپیرانمان بوو ) ئەم قوچکیریانە •• کۆمەڵێـکی سادەوساکارو •• هێمنن •• کە حـەز لە شەڕو شۆڕو ئـاژاوە نانەوە نین •• ئەگەرچی •• موسلمانکانی ناوچەکە ئەڵێن گوایە •• ئەمانە •• پیلان گێڕو خوێن ڕێژو پیاوکوژن پیمـوایە • • هەندێك لەم هۆزە •• لەو ناوچە کەم ناسراوەی باکـوری •• ( سیڤاس – زارا )ەوە •• ئەژین •

لە بەر کەم دەرفەتی •• نەمتوانی •• زیاتر لە سەر ئەم مەسەلەیە

بڕۆم •• ئەم هۆزە •• بەم شێوەیەی لای خوارەوە لق و پۆی بڵاوبۆتەوە ••

أ ـ ساروولار ( Sarolar )

ب ـ بارلولار ( Barlolar )

ج ـ کاروالار ( Caralar )

د ـ ئایبولار ( Ibolar )

هـ ـ ئاسیکی کوجکیری ••• کۆن •• (٤٠٠) خێزانن• ئەم هۆزە •• لە نزیك ئەرزنجانەوە •• جێ گیرە •• هەرچەندە •• مۆچکیریەکان ئەڵێن •• ئێمە هیچ جۆرە پەیدەندیەکمان لەکەڵیاندا نی یە ئەگەرچیش ئەمانە بە زەبرو زۆر لە ناوچەی قۆچکیری دوورخراونەتەوە ••• لە لایەن هۆزەکانی بەشی ( E ) ژمارە (C) , (A) , (B) , (C) , (D) •• جا لەمەش ئەتوانین ئەو ڕاستی‌یەمان بەدەست کەوێت کەوا قۆچکیری ناوی ڕاستەقینەی ئەم بەشە نی یە ••

٣ ـ کورجیك ( Kurejik )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• ئەم ناوە لەوە ناچێ زۆر بلاو بێ ••

٤ ـ سینامینلی ( Sinaminli )

(٢٥٠٠) خێزانن •• ئەمە هۆزێکی گەورەی شیعەی ڕاستەقینەیە •• کە لە دەوروبەری •• ناوچەی (مالاطیا)دا

گیرساونەتەوە ... هەندێ وشەی فارسی لە شێوەی ئاخەفتنەکەیدا بەدی ئەکرێ .. میوان پەرورو گفت‌و لفت شیرینن .. دایەم‌و دەرهەم برایانە لەگەڵ ئەو گەڕیدە ئەوروپاییانە کە ناوبەناو سەر لە ناوچەکە ئەدەن لە بەر هۆیەك یان هۆیێکی دی .. جولاّونەتەوە ... ئەم ڕاستی‌یەشی .. ڕەنگە وا لە هەندێ کەسی بکات کە لەو باوەڕەدا بن کە شیعەکان بەگشتی‌و قزلباشەکان بە تایبەتی .. وابن .. هەر چەندە من وەك کەسێك تاقیکردنەوەیەکی تفت‌و تاڵم لەگەلیاندا هەبوو .

٥ ـ ئەلخاس ( Al-Kass )

٥٠٠ خێزانن . هۆزێکی چیایی‌کەش‌هەلە هەیە بەم ناوە لە باشوری ڕۆژهەلاّتی شاری [حلب]ەوە ..کە لەوانەیە ئەم ناوەی لێ وەرگیرابێ .

٦ ـ خدر زور ( ژور ) ( Kodirzor )

٦٠٠ خێزانن

٧ ـ قەرە حەسەن ( Kara Hassan

(٣٠٠) خێزانن .. ڕەنگە ئەمانە بە نەژاد تورکمان بن هەر چەندە بەلگەیەکی واشم بەدەستەوە ..نی‌یە لێ‌ی دلنیا بم

٨ ـ جوغر ریشانلی [جگرریشانلی] ..

(٥٠٠) خێزانن .. ڕەنگە ئەمانە نیشتە جێ بن

٩ ـ نیدیرلی ( Nederli )

ژمارەی خێزان .. نەزانراوە

١٠- دوغـانلی ( Doghanli )

(٢٥٠) خێزانن •• ئەمانە کۆچەرن •

١١- دیلیـانلی ( Dellianli )

خێزانێکی کۆچەری گچکەیە ••کە لە نزیك (مرعش)ەوە نیشـتە جێیـە •

١٢- جیلیـکانلی ( Jellikanli )

ژمارەی •• نەزانراوە •• ئەم هۆزە بۆتە دوو بـەشـەوە یەکەمیان لە ناوچەی (وان)ەو ئەوی تریان لە دەشتی (مرعش)دا •• پەرتو بڵاوە •• بەشی دوومیان شوانی هەژارو بێ دەرامەتن

١٣- لـەك کـوردی ( Lek Kurdi )

ژمارەی خێزان نەزانراوە •• ئەمە •• هۆزێکی گچکەیە •• لە نزیك (ئەدەنە)ەوە جێگیرە •• ئەڵێن ئەمانە بە تـورکـی ئاخافتن دەکەن •• ناوەکەشیان لە ناوی هوزێکی کوردی سەر سنوری (ئێران) ئەچێ •• هەروەهاش ئەڵێن هەندێکی کـەش هەن •• لەمانە کە ئێدیش هەر لەژێر دەستەڵاتی ئێرانیەکانن •

١٤- دیلی کـانلی ( Dellikanli )

(٢٠٠) خێزانێکن •• هۆزێکی کۆچەرە ••• لە سەرانسەری دەشتی (مرعش)دا پەرتو بڵاوە پیاوەکانیان کەڵەگەتو بتەوندو •• ئافرەتە کانیشیان شۆخو شەنگو جوانن •

ئەم خێڵە لە خێوەتو دەواری کورد ئاسادا ئەژین لە دامێنی

چیای (نوروس)دا .. زستانیش کۆچ ئەکەن بۆ ناوچەیەك .. کە تەنها (٣٠) میل لە ڕۆژاوای (کیلیس)ەوە دووره .

١٥- بیلیکانلی ( Bellikanli )

(٢٥٠) خێزانن .. کۆچەرێکی تەواون ... بەشێوەی کرمانجی .. ئاخافتن ئەکەن لە نێوانی دۆڵەکانی(مرعش)دا هاتوچۆ ئەکەن .. ئەسپیان نییە .

## بەشی ( F )

ئـەم هەرێمە بە تەواوی ناکەوێتە چوار چێوەی سـنورە مێژوییەکەی کوردستانەوە •• چونکە ئەو کۆچ‌کردنە بەزۆرەی ئەو هۆزە دوور خراواتەی تێکرای ناوچەی کوردستان ئەخاتە روو •• کە وادی خۆی سولّتان (سلیم)ی داگیرکەر لە ناوچەی باوك‌و باپیرانیانەوە •• دووری خستنەوە •• ئەم نەخشەیە •• ئەو خالّانە ئەخاتە ڕوو کە لە بارەی شوێنەواری ئەسلی‌یان ئەدوێ• بایەخێکی ئەوتۆ بەم مەسەلەیە دراووە لەم زانیاریە •• کە کوت‌و مت •• چۆن بیستم •• لە چەن پیاوێکی ماقولّەوە لە هـۆزانی ژمارە (١٥) و(١٧) لە نزیك (ئەنگورا)وە هەروەهاش ئا لێرانـە دامڕێژاوەتەوە •• ئەو پیاوانە هـەمان جـل‌و بەرگ‌و هـەمان چۆرە جامانە ئەبەستنەوە ئەوەی سەرنج ڕائەکێشی لێـرەدا •• ئەویە ••کە جامانە بە شێوەیەکی نامۆ ئەپێچنەوە ••• لە نزیك (ئەرزنجان)ەوە هەمان (تێبینیم) بە بەرچاوت کەوت •• بەڕاستی پێچانەوەی جامانە •• لێرە ••زۆر ناسازەو لـەوانـەی تـری شـوێنەکـانی ری‌ی کوردستان گەلێ جیـاوازن ••• هـەنـدێ تورکیش لە سەریان کردبوون ••• کە پرسیارم لە هەندێکیـان کرد •• مانای ئەم جۆرە بەستنەوەیی چی‌یە ؟ •• خێرا ولاّمیان

دامەوەو وتیان •• ئێمە وەچەی (جانی سەریەکانین) کەسولتان (سلیم) وادی خۆیو پاش سەرکەوتنەکەی ••• ئەرزو ئاوێکی زۆری خەلاتکردین ••• سەرداتێکی ئەو مۆزەخانەیە کە پاشماوەی جانی سەریەکانی تێدایە •• گەلێ شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ••• هەروەها سەیرکردنی •• جێ پەنجەی سەردەمی سوڵتان (سلیم) بەسەر روخساری ناوچەکە •• ئەڕە خسێنێوە•• ئەوەش ساغئەکاتەوە کە مێزەرو جامانەی ناوبراو •• کە ئێدی باوی نەماوە •• مێزەر لە سەرکراوەکەی ئەو ڕۆژگارە بووە : هۆی لە سەرکردنی لە لایەنی ئەو دوو کۆمەڵگایە روونە •• ئەوی جانی سەریەکان لە تورکەکانی تر دوور خراونەتەوە •• بەڵام نەریتی باووباپیرانیان لە بیر نەکردووە • هۆزەکانی ناوچەی (ئەنەدۆڵ) دیارە •• یەکسەر پاش شار بەدەرکردنیان •• ناچار کران جلو بەرگی تورکی لەبەر بکەن •

١ ـ ئۆخا چیسمی

[٣٠٠] خێزانن •• نیشتە جێن

٢ ـ ئـوروك لی ( Uruchili )

(٤٠٠) خێزانن ••لەوە ئەچێ ئەمانە (تورکمان) بن

٣ ـ میلی ( Mili

(٢٠) خێزانێك ئەبن ••• کۆمەڵێ •• شوانن لە نزیکی (عوسمانجیك)ەوە نیشتەجێن •• ووتیان ئێمە (میللین) ••• دیارە •• لە (دەرسیم) یان لە (کەراجەداغ)ەوە بۆئەم ناوچەیە هاتوون •

٤ – شـــيخ بـزەيـنـی (Shaykh Bezaini)

(١٢٠) خێزانن •• کـــۆچـــەرن •• لـــە دەوروبـەری (بویائاباد)ەوە ••• لە ناوچەی (ئەنەدوڵ)ەوە •• گیرساونەتەوە •• دیارە ئەمانەش لەوانەن کەوادی خۆی (سولتان سلیم) لـە شوێنی باوكو باپیرانیانەوە بەزۆر ••• هەڵی‌کەندنو ڕەوانەی ئەم ناوچەیەی کردن لە ژمارە (٣)ی بەش (A) ەوە •• ئەمانـە جلو بەرگ ، بە دەســتوری ئەنەدوڵی‌یەکـــان لە بەرئـەکەن هەرچەندە ئیدیش هەر بە کرمانجی ئاخەفتن ئەکەن .

٥ – شــیڤیلی (Sheveli)

ژمارەی •• خێزان •• نەزانراوە •• ئەمانە بە زۆر کۆچیان پێ‌ی‌کراوە لە ژمارە (٧١)ی (E) بەشـی (A) ەوە .

٦ – بـەدیـلی (Badeli)

(٢٠٠) خێــزانــن •• تیرەیەکی نیشتەجێ‌یە لـــە نـزیـك (یوزغات)ەوە ••• (Yuzghat) •• گیرساوەتەوە ئەمانە •• ئیستە سونین ئەڵین حەفتـا ساڵ لەمەوبـەر شـیعە بوون ••• لەوەش ئەچێ بـە زۆر بۆ ئەم شوێنە کۆچیان پێ کراوە •• لـە ژمـارە (١) (D) بەشـــی (E)

٧ – حاجی بانـلی (Haji Banl)

(٣٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرن •• ئەمانە تیرەیەکن لە ژمارە (١)ی بەشی (C) کە لە ناوچـــەی (گــەراجەداغ)دا

گیرساونەتەوە •• پێم وایە ئەمانیش بەزۆر لە (دەرسیم) یان (گەراجەداغ)ەوە •• بەرەو ئەم ناوچەیە ڕاپێچراون •

أ ـ خاتون ئوغلی ( Khatun Ogli )

(٤٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرن •• ئەمانە سەر بەهۆزی ژمارە (١)ی بەشی (٢)ن• لە ناوچەی (کەراجەداغ) دا •• ڕەنگە ئەمانە بە نەژاد تورکمان بن •

ب ـ ماخانلی (Makhanli )

(٣٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرن •• تیرەیەکن لە ژمارە (١)ی بەشی ( C ) لە ناوچەی گەراجە داغدا

ج ـ اومرانلی ( Omaranli )

(٨٠٠) خێزانن •• نیمچە کـۆچـەرن •• تیرەیەکن لـە ژمارە (١)ی بەشی (C) لە ناوچەی کەراجەداغدا •

٨ ـ بـەرەکـانلی ( Baraktli )

(١٠٠٠) خێزانن

٩ ـ تـابـور ئوغلی ( Tabuoghli )

(٣٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرن •• بە ناوەکەیاندا لـە تورکمان ئەچن •• بەڵام دلنیایانکردم کە ئەمانە کوردن •

١٠ـ شیخ بزەینی ( Shaykh Bezeini )

خێزان ؟• ووتیان هەندێکیان لە نزیك ئالاش کیردەدا ••

نیشتەچێن •• ئەمانە لە تیرە (٣)ی بەش ( A ) ەوە •• بۆ ئەم ناوچەیە بەربونەتەوە •

١١- جودی خانلی ( Judi Khanli )

(٢٠٠) خێزانن •• ڕەنگە لە کەژی (جبل جودی) نزیک شیرناخەوە ••• هاتونەتە ئەم شوێنە •

١٢- خالکانی ( Khalkani )

(٤٠٠) خێزانن •• ئەمە ناوی هۆزێکە کە ئێستە لە چالاکی کەوتوە •• بەڵام وادی خۆی لە نزیک (ڕەواندوز)ەوە •• گیرسابووەوە •

١٣- سیف خانی ( Seif Khani )

(٥٠٠) خێزانن •• نیمچە کۆچەرن

١٤- نەسورلی ( Nasurli )

٦٠٠ •• خێزانن

١٥- تیریکان •• ( Tirikan )

(٤٠٠) خێزانن •• ئەم کۆمەڵگا کوردە • لە سەرووی ئەو هێڵە ئاسنە ••کە تەنها (٢٤) میل لە ڕۆژاوای ( ئەنگورا )وە جێگیربوونەتەوە جا ئەگەر •• خۆێنەری بەڕێز بیەوێ شتێ لە بارەیانەوە •• بزانێت ئەوە ئەبێ سەیرێکی ژمارە (٩)ی بەشی ( B ) بکات •

١٦- ئاتمانیەکان ( Atmanikan )

٢ر٩٢٩

ج ٢٧ جاف ، حسين احمـد

هۆزەكانى كورد / وەرگێڕانو ئامادە كردنى
حسين احمد جاف . ـ بەغدا : دەزگـاى رۆشنبيرى
وبلاوكردنەوى
كوردى ، ١٩٩٢ .

ب٢ ؛ ٢٤ سم ـ ( زنجيرەى ژمارە ) ٢٨٧ )
١ـ هۆژكانى كـــورد ـ مێژوو ١ ـ أ ـ ناويشـــان
ب ـ زنجيـــره

١ . و
٩٩٢ /٦٨٢

كتێبخانەي نێشتماني ( پێرست كارى لە بلاوكردنەوەدا )

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق
ببغـداد ٦٨٢ لسنة ٩٩٢

